# ڕاڤەی پەرتوکی

# لمعة الاعتقاد الهادي إلى سبيل الرشاد

نووسینی

موفق الدين أبي محمد عبدالله بن أحمد بن محمد بن قدامة المقدسي

وەرگێڕانی

ئاکۆ جلیل کریم

مافی لە چاپدانی پارێزراوە بۆ

# نارین

| | |
|---|---|
| ناوی کتێب | ڕاڤەی پەرتوکی لمعة الإعتقاد الهادي إلى سبيل الرَّشاد |
| نوسینی | موفق الدين أبي محمد عبدالله بن أحمد بن محمد بن قدامه المقدسي |
| ڕاڤەکردنی | شيخ محمد بن صالح العثيمين |
| پێداچوونەوەو پێشەکی | د. عبداللطيف أحمد مصطفى<br>م. عبدالرحمن حسين پور |
| لێکۆڵینەوەو تەخریجی فەرمودەکان | أشرف بن عبدالمقصود بن عبدالرحيم |
| وەرگێرانی | ئاکۆ جلیل کریم |
| نەخشەسازی ناوەوە | کۆمپیوتەری نارین (محمد علی) |
| ساڵی چاپ | ٢٠١٢ ز |
| ژمارەی سپاردن | (١٧٧٤)ی ساڵی (٢٠١١)ی پێدراوە. |

بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی
website: www.nareenpub.com
E-mail: info@nareenpub.com
nareenpub@gmail.com
تەلەفۆن: ٢٥١١٩٨٢ ٦٦ (٠٠٩٦٤)

مۆبایل: ٠٠٩٦٤ ٧٥٠٤٠٦٤٦١٠



دار المعرفة | اشراف و تنفيذ طباعي دار المعرفة بيروت لبنان
WWW.MAREFAH.COM

# ڕاڤەی پەرتوکی

# لمعة الإعتقاد الهادي إلى سبيل الرَّشاد


نوسینی

موفق الدين أبي محمد عبدالله بن أحمد بن محمد بن قدامة المقدسي

وەرگێڕانی

ئاكۆ جليل كريم



ناريـن

## پێشەکی : د.عبداللطیف أحمد مصطفی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله .

بێگومان ڕێنمایی مروڤ بە ڕاستێتی و ناڕاستی عەقیدەو بیروباوەڕکەیەوە بەندە، وەهەروەها بەهەشت و جەهەننەمی گشت کەسێکیش هەربەوە وە بەندە.

کەوابوو پێویستە موسڵمان هەوڵی فێربوونی عەقیدەیەکی ڕاست و دروست بدات وەتەنها ئەو عەقیدەیەش ڕاستەکە پێغەمبەر صلی الله علیە وعلی آلە وسلم و هاوەڵە بەڕێزەکانی لەسەر بووە نەك ئەو بیروباوەڕو عەقیدانەی کە گروپە داهێنراوەکان دایانهێناوە وەك عەقیدەی (( قەدەری و جەبری و موعتەزیلی و خەواریج و مورجیئە)).

لەو باشانەش کەلەسەر عەقیدەو بیروباوەڕی سەلەفی صالح نووسراون﴿لمعة الإعتقاد﴾ی شیخ ئیبن و قودامەیە وەشەرحەکەی شێخ إبن عثیمین زیاتر کتابەکەی ئاسانترو پێزکردووە و ڕونی کردوەتەوە و بەڵگەی زیاتری لەسەر هێناوە خواپاداشتی خێریان بداتەوە، وەسوپاس بۆ خوا منیش هەڵسام بەشەرحکردنی بە زمانی کوردی بۆ قوتابیان وەشەرحەکەش تەسجیل کراوە، بەڵام برای بەڕێزمان مامۆستا ئاکۆ هەڵساوە بەوەرگێڕانی شەرحەکەی شێخ إبن عثیمین بۆ زمانی کوردی و ئەمەیە کە ئێستا لەبەردەستی خوێنەری بەڕێزدایە .

جاداواکارم خوای گەورە بەرەکەت بخاتە گشت ئەو کارانە، وەسوود بەخشیان بکات و بیکاتە توێشووی دوا ڕۆژ وە موسڵمانان لێیان بەهرەمەندبن وە خوا پاداشتی مامۆستا ئاکۆ بدات لەسەر ئەم خزمەتەی وە بەردەوامی بکات لەسەر کاری ئاوا خێر.

والحمد لله وصلى الله على رسول الله

عبداللطیف أحمد مصطفی

## پێشەکی مامۆستا عبدالرحمن حسين پور

بسم الله الرحمن الرحيم

بایەخدان بەباوەڕو عەقیدە گرنگترین کردەوەی ئینسانی ئیمانداره چونکه پایەو ئەساسی هەموو وتەو کردەوەی چاکەیە، ئەگەر باوەڕو عەقیدەی ئینسانی ئیماندار ڕاست نەبێت ئەوا کردەوە و وتەی چاکەی لێ وەرناگیرێت .

پێغەمبەری ئازیز صلی الله علیه وعلی آله وسلم لە سیانزە ساڵی دەعوەت و بانگەوازی مەککەیدا باوەڕو عەقیدەی ساغو صەحیحی لە دڵی هاوەڵاندا چەسپاند و پاشان کردەوە و وتەی ڕاست و چاك و پاکی فێرکردن .

هاوەڵانی بەڕێز دەفەرموون پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم ئیمان و باوەڕو عەقیدەی فێرکردین بەرلەوەی قورئانمان فێربکات .

سوپاس بۆ الله کە ئەمڕۆ نامیلکەو کتێب لەم بارەوە زۆرە و لەناویاندا ﴿لمعة الإعتقاد الهادي إلى سبيل الرَّشاد - دانراوی پێشەوا ئیبن و قودامەی مەقدیسی﴾ لەباشترینیانە لەبەرئەوەی کە شەرحی یەکێك لەزانایانی لێکۆڵەرەوەی لێهاتوو کارامەی وەك شەیخ إبن عثیمینی ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت لەسەرە کە شوێنە کورت و هەروەها شوێنە قورسەکانی ڕونکردۆتەوە، خوای گەورە پاداشتی برای خۆشەویستم ﴿م. ئاکۆ جليل كريم﴾ بداتەوە کە هەستاوە بەم ئەرکە جوانە کە وەرگێڕانیەتی بۆ سەر زمانی کوردی هیوادارم خوای گەورە بیکاتە مایەی تێگەیشتن لە بیروباوەڕی ڕاستەقینە بۆ موسڵمانانی کورد.

وصلّى اللهُ على سيِّدِنا ونبيِّنا محمَّدٍ وعلى آلِه وصحبِه وسلَمَ

براتان: عبدالرحمن حسين پور

## پێشەکی وەرگێڕ

إن الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَ نَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوْذُ بِاللهِ مِن شُـرُوْرِ أَنْفُـسِنَا وَمِـنْ سَـيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَـلا هَـادِيَ لَـهُ ... وَأَشْـهَدُ أَنْ لا إِلَـهَ إِلاّاللهُ وَحْدَهُ لاشَرِيْكَ لَهُ ... وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ. .

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران: ١٠٢

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾ النساء: ١

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب: ٧٠ – ٧١

أَمَّا بَعْدُ: فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيْثِ كِتَابُ اللهِ وَخَيْرَ الهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ صلى الله عليه وعلى آله وسلم وَشَرَّ الأُمُوْرِ مُحْدَثَاتُهَا وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَـلالَةٌ وَكُـلَّ ضَـلالَةٍ فِـي النَّارِ.

موسـوڵمانانی بـەڕێز ، برایـان و خوشـکانی دڵـسۆزم – خوێنـەری سـەنگین و خۆشەویست:

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته :

سوپاس بۆئەو خوایەی لەناو دروستکراوەکانیدا بە ژیرترنیان دروستی کردووین کە مرۆڤەکانن وەلەناو مرۆڤەکاندا بە ژیرترینیان بەدیهێناوین کە موسڵمانان وەلەناو موسڵماناندا ئەهلی سوننەو جەماعەین کە خاوێنترین و ژیرترین مرۆڤی سەر ڕووی زەوین ئەوانەی کە بەتەنها سەری بەرزیان بۆ خوای گەورە الله نەویدەکەن وە پەرستش

بە تەنهایی بۆ ئەو ئەنجام دەدەن سوپاسی دەکەین ئەوە چاکەی خۆیەتی بەسەر ئێمەوە، وەدروودو سلاّوێك کەشایستەی چاکترین و بەرێز ترین دروستکراوی خوایە لەسەر پێشەواو سەروەرمان رێ رۆشنکەرەوەی ژیانمان موحومەدی هەڵبژێردراو بێت صلی الله علیە وعلی آلە وسلم ئەو پێغەمبەرەی هەموو نارِەحەتی و ئازارێکی چەشت بۆ سەرخستنی یەکخواناسی و نەهێشتنی هاوبەش بۆ خوا پەیداکردن و ئەنجامدانی هەموو جۆرەکانی پەرستش بەتەنها بۆ خوای تاك و تەنها، هەر ئەو بوو فێریکرین و موژدەی پێداین کەلەفێربوونی زانستدا چ پاداشتێك هەیە هەروەکو دەفەرموێت : ﴿ مَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْمًا سَهَّلَ اللَّهُ لَهُ طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ وَإِنَّ الْمَلَائِكَةَ لَتَضَعُ أَجْنِحَتَهَا لِطَالِبِ الْعِلْمِ رضى بما يصنعُ وَإِنَّ الْعالِمِ لَيَسْتَغْفِرُ لَهُ مَنْ فِي السَّمَوَاتِ ومن فِي الْأَرْضِ حَتَّى الْحِيتَانِ فِي الْمَاءِ وَفَضْلُ الْعَالِمِ عَلَى الْعَابِدِ كَفَضْلِ الْقَمَرِ عَلَى سَائِرِ الْكَوَاكِبِ إِنَّ الْعُلَمَاءَ وَرَثَةُ الْأَنْبِيَاءِ إِنَّ الْأَنْبِيَاءَ لَمْ يُوَرِّثُوا دِينَارًا وَلَا دِرْهَمًا إِنَّمَا وَرَّثُوا الْعِلْمَ فَمَنْ أَخَذَهُ أَخَذَ بِحظ وَافِرٍ ﴾[1]

واتە :﴿ هەرکەرسێك رِێگەیەك بگرێتە بەر تیایدا زانستێك فێربێت ئەوا خوای گەورە رِێگەیەکی بۆ بەهەشت بۆ ئاسان دەکات وە فریشتەش باڵەکانی بۆ فێرخوازی زانستی شەرعی دادەنێت لەبەر رِازی بوونی بەوەی کەدەیکات، وە کەسی زانا ئەوەی کە لە ئاسمانەکان و زەویدایە تەنانەت حوتەکانیش لەناو ئاودا داوای لێخۆش بوونی بۆ دەکەن وە گەورەیی زانا بەسەر کەسی خواپەرستدا وەکو گەورەیی مانگ وایە بەسەر هەموو هەسارەکاندا، زانایان میراتگری پێغەمبەرانن سەلامی خوایان لێ بێت، پێغەمبەرانیش سەلامی خوایان لێ بێت دینارو درهەمیان لەدوا بەمیراتی بەجێ نەهێشتووە بەڵکو زانستیان لەدوا بەمیراتی بەجێ نەهێشتووە جا هەرکەسێك ئەو زانستە ببات ئەوا بەشێکی

[1] حسن : صحيح الترغيب ٦٨، رواه أبوداود ( ٣٦٤١-٣٦٤٢) في العلم، والترمذي (٢٦٨٣-٢٦٨٤)

زۆرو فراوانی بۆخۆی بردووە ﴾، وەهەروەها دەفەرموویت : :﴿ إذا مات الإنسان انقطع عمله إلا من ثلاث صدقة جارية أو علم ينتفع به أو ولد صالح يدعو له﴾[١]

واتە :﴿ ئەگەر مرۆڤ مرد کردەوەی کۆتایی پێدێت و دەپچڕێت تەنها سیان نەبێت کەئەوانیش خێرێکی لەبەرڕۆیشتوو وەکو دروستکرنی مزگەوتێك ....هتد یان زانستێك سوودی لێ ببینرێت یان مندالێکی چاك بۆی بپاڕێتەوە ﴾، کەواتە پێویستە بەبەردەوامی صەڵاواتی بۆ بنێرین و داوای بەرزکردنەوەی پلەو پایەی بکەین لەبەهشتەکەی خواداو ﴿ مقام المحمود ﴾ ی بە نسیب بکات .

ئازیزان زۆر دەمێك بوو ئاواتە خوازبووم کە موسڵمانانی کوردی بەڕێز ئاشنابوونایە بەو پەرتووکانەی کەسوودێکی زۆری تیادایە بۆ دین و ژینی مرۆڤەکان بەتایبەتی پەتووکەکانی بیروباوەڕ کە شارەزابوون لێیان سەربەرزی دونیاو دوارۆژی هەموو مرۆڤێکی خاوەن عەقڵی تێدایە، زانایانی ئیسلامیش هەرلەسەردەمی پێغەمبەری خۆشەویستمانەوە صلى الله عليه وعلى آله وسلم تاکو ئێستا ساتێك نەبووە کۆڵبدەن لەوەی بیروباوەڕی خاوێن بۆ خەڵکی ڕوونبکەنەوە بەبەردەوامی لە نووسین و ووتنەی وانەکانیدا بوون بۆ ڕێنمویی کردنی خەڵك و پاراستنیان لە بیروبۆچوونە نامۆو گومڕاکەرەکان، لەچینی پیرۆزی هاوەڵانەوە بگرە تا دەگاتە شوێنکەوتەکانیان و پێشەوایانی پایەبەرزی ئیسلام وەکو ﴿ ئەبو حەنیفەو مالیك و شافیعی و ئەحمەدو یەحیای کوڕی موعین و سوفیانی سەوری و پاشان بوخاری و موسلیم و پێشەوایانی فەرموودەو شەیخی ئیسلام و نوێکەرەوەی و لەناوبەری شیرك و بیدعە ئیبن و تەیمیەو قوتابیە بەڕێزەکانی وە ئیبن و قودامەو قوتابیەکانی وە تادێینە سەر شەیخی ئیسلام ونوێکەرەوەیو لەناوبەری شیرك و بیدعە موحومەدی کوڕی عبدالوهاب و نەوەو قوتابیانی تائێستاشی

[١] رواه مسلم في الوصية رقم ( ١٦٣١)، باب ( مايلحق الإنسان من الثواب بعد موته )، وأبوداود (٢٨٨٠) فى الوصاىا، والترمذي (١٣٧٦) .

لەگەڵدا بێت کەهەرچی سونییەك دەبینیت لەزانستی ئەو کەڵە پیاوەی ئیسلام بەهرەمەند بوو‌بێــت تەماشــای دەکــەی موســڵمانێکی یــەکخواناس و شــوێنکەوتەی ڕاســتەقینەی پێغەمبــەری خوایــە صــلی الله علیــە وعلــی آلــە وســلم دوژمنــی شــیرك و هــەڵگرانین خۆشەویــستی تەحیــدو پــەیڕەوانین، جایــەکیك لــەو زانــستانەی کــە زۆر پێویــستە شارەزابوونی زانستی ناو و سیفەتەکانی خوای پەروەردگارە کــە ناســراوە بــە ﴿ توحیــد الأسماء والصفات﴾ لەناو جۆرەکانی تری تەوحیــددا، زانایــان زۆر بایــەخیان پێــداوە بــە ڕوونکردنەوەی ناو و ســیفەتەکانی خــوای گــەورەو ڕەددانــەوەی ئەوانــەی گــومڕان و باوەڕیان پێی نیەو دەیگۆڕن و دەیچوێنن بە دروستکراوەکانیەوە واتاکــەی پــەك دەخــەن وەکو ﴿ ڕافیزیەکان و موعتەزیلەکان و جەهمیەکان و خەواریجــەکان و قەدەریــەکان و جەبریەکان و ئەشعەریەکان و هەر ڕێچکەیەکی گومڕایی تر هەبووبێت یان پەیدا بێــت و قسەی ئــەوان بکــات یــان قــسەی نــوێ دابێــنن ﴾ زانایــانی ئیــسلام ڕەدی هــەموویانیان داوەتەوەو پەرتووکیان لەسەر داناون وەکو پێــشەوای ئــەهلی ســوننە ئەحمــەدی کــوڕی حنبەل و بەیهەقی و ئیبن و قودامەو ئیبن و تەیمییەو زەهەبیی و ئین و عوسەیمین و دەیــان و سەدانی تریش ﴾ کەبەهەمیــشەیی لــە کەمینــدا بــوون بــۆ ڕێگرتنیــان و ڕونکردنــەوەی سەرلێشیواویان، لەو پەرتووکە بەنرخانەی لەو بواردەدا دانــراون زۆرن لەوانــە ﴿ الــرَّد على الزنادقة والجهمية – دانراوی پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل﴾ وە ﴿ بیــان تلبیــس الجهمية في تأسـيس بـدعهم الكلاميـة وە منهـاج الـسنة النبويـة في نقـض كـلام الـشيعة والقدرية – دانراوی پێشەوا ئیبن و تەیمیە ﴾ وە ﴿ إجتماع الجيوش الإسلامية على غـزو المعطلة والجهمية و الصواعق المرسلة في الرد على الجهمية و المعطلة – دانراوی پێــشەوا ئیبن ولقەیم ﴾ وە ﴿ الرد على الجهمية – دانراوی پێــشەوا ئــیبن مەنــدە﴾ وە ﴿الــرد على الجهمية – دانراوی پێــشەوا دارەمــی ﴾ وە ﴿ الــرد علــى الأشـاعرة والمعتزلـة – دانراوی محمد أمان بن علـي الجـامي ﴾ ئەمانــەی کــە ڕابــوورد بەتایبــەتی زانایــان ڕەدی

گومڕایانیان داوەتەوە و ئەوە مشتێکە لەنموونەی خەرمانێك، بەڵام هەندێك لەزانایان هاتوون پەرتووکیان داناوە دەرباوەی ڕوونکردنەوەی ناو و سیفەتەکانی خوای گەورە بە شێوەیەکی گشتی و لەگەڵیشیدا ڕەدی ئەوانەیشیان داوەتەوە پێچەوانەی ئەهلی سوننە و جەماعەن وە بیروباوەڕی ئەهلی سوننەشیان بەکورتی تیادا باسکردووە لەباشترین ئەو پەرتووکانە وەکو ﴿ العقيدة الواسطية، الحموية, التدمرية – دانراوی پێشەوا ئیبن و تەیمیە﴾ وە ئەم پەرتووکەی بەردەستمان کە هەڵدەستین بەوەرگێڕانی إنشاء الله ﴿ لمعة الإعتقاد الهادي إلى سبيل الرَّشاد – دانراوی پێشەوا ئیبن و قودامەی مەقدیسی ﴾ کەیەکێکە لەباشترین پەرتووکەکانی بیروباوەڕو زانایانی خواناس زۆر بایەخیان پێداوە و ڕاڤەیانکردووە و هەستاون بەووتنەوەی بە فێرخوازان و زۆر گرنگیان پێداوە، جامنیش وەکو خزمەتکارێکی ئەم دینە پاك و جوانە بەئەرکی سەرشانی خۆمم زانی هەستم بە پێشکەشکردنی خزمەتێك لەو بوارەداو ڕۆشنکردنەوەی بیرو هۆشی موسڵمانان بەبیروباوەڕی ڕاست و دروستی ئیسلامی بۆئەوەش هاتووم پەرتووکی ﴿ لمعة الإعتقاد الهادي إلى سبيل الرَّشاد – دانراوی پێشەوا ئیبن و قودامەی مەقدیسی ﴾ بەشەرحکردنی ﴿ پێشەوای ئەهلی سوننەو جەماعە محمد بن صالح العثيمين ﴾م هەڵبژاردووە کەهەرکام لەو دووپێشەوایە زۆر لەوە گەورەترن من بدوێم لەسەریان و لەناو پەرتووکەکەدا لەسەرژیانی هەردوو کیان کورتەیەك نووسراوە، ئەوەی ماوەتەوە باسی بکەم سوپاسکردنی هەردوو مامۆستای بەڕێزو خۆیست ﴿ دکتۆر عبداللطيف أحمد مصطفى وە مامۆستا عبدالرحمن حسين پور﴾ە خوای گەورە پاداشتی بەخێریان بداتەوە و تەمەنیان درێژبکات بۆخزمەتکردنی ئیسلام و موسڵمانان کە ئەرکیان کێشا بە پێداچوونەوە و پێشەکی بۆ نووسینی ئەم پەرتووکە بەسوودە ﴿ لمعة الإعتقاد الهادي إلى سبيل الرَّشاد – دانراوی پێشەوا ئیبن و قودامەی مەقدیسی ﴾ کەهەریەکە لەو دوو مامۆستا پایەبەرزە دەستێکی باڵایان هەیە بۆ خزمەتکردنی ئاینی پاك و پیرۆزی ئیسلام و هەوڵدان بۆ

خاوێنکردنەوەی بیروباوەڕی موسڵمانان لە شیرك و بیدعە و خورافەو هەموو جۆرەکانی تێکدانی بیروباوەڕی موسڵمانان بۆیە پێمخۆش پێداچوونەو پێشەکی بۆ بنووسن ئەوانیش خوا بیانپارێزێت وەڵامی داواکەیان دامەوە و ئەو ئەرکەیان کێشا .

**لەبەر چەند هۆیەك ئەم پەرتووکەم هەڵبژاردووە بۆئەوەی وەریبگێڕم :**

١ . لەبەر ئەوەی دانراوی شەیخی ئیسلام ئیبن و قودامەی مەقدیسیە کەیەکێکە لەو زانایانەی گرنگیان بە یەکخواناسی داوەو ئەم پەرتووکەیشی شاهێدی ئەوەیە.

٢ . لەلایەن پێشەوای ئەهلی سوننەو جەماعە ﴿محمد بن صالح العثيمين﴾ەوە ڕاڤەکراوە ئەم زانایە یەکێکە لەگەورەترین ئەو زانایانەی مێژووی ئیسلام بەخۆیەوە بینیویەتی و بەرهەمەکانی و فێرخوازەکانی و قەبوولکردنی لەلایەن موسڵمانانەوە باشترین بەڵگەن بۆئەوە.

٣ . پەرتووکێکی پوختە دەربارەی بیروباوەڕو کۆکەرەوەی بابەتەکانیەتی بەتایبەتی لە بواری ناو سیفەتەکانی خوای گەورەدا، وەڕاڤەکەیشی زۆر جوان و بەهەمانشێوە پوخت و زانستیە .

٤ . نەبوونی پەرتووکێك لەو بوارەدا لەناو کتێبخانە کوردیەکاندا کەمن بەش بەحاڵی خۆم پەرتووکێکی لەو شێوەیەم نەبینیوە بۆیە حەزمکرد لەبواری ناو و سیفەتەکانی خوای گەورەدا شتێکی ئاوا پوخت بەزمانی کوردی هەبێت.

وصلّى اللهُ على سيِّدِنا ونبيِّنا محمَّدٍ وعلى آلِه وصحبِه وسلَمَ

براتان ئاکۆ جلیل کریم ﴿ گۆخلانی ﴾

ڕۆژی سێ شەممە – ٢١– جەمادی کۆتایی – ١٤٣٢ کۆچی

٢٤– ٥– ٢٠١١ زاینی

## ﴿ کاری من لەم پەرتوکەدا ﴾

١- هاتووم دەقی پەرتووکەکەی ﴿لمعة الإعتقاد الهادي إلى سبيل الرَّشاد ﴾ م وەکو خۆی هێناوە لەبەرئەوەی کەسی خوێنەرو فێرخوازی زانست نەڵێت خۆزگایە دەقی پەرتووکەکە لەگەڵ ڕاڤەکەدا بهاتایە ئەوەتا هێناومە تا سوودەکەی زیاترو گشتگیرتر بێت و بەم نیشانەیە و هاوشێوەکانی جیامکردۆتەوە ➡، ➡.

٢- پاشان دەقی عەرەبیکەم کردووە بەکوردی وەك خۆی ئەگەر ناڕوونیەك هەبێت بەشێوەی جیاو لەنێوان کەوانەدا بەم شێوەیە ﴿ ﴾ ڕوونمکردۆتەوە.

٣- ڕاڤەی پێشەوا ﴿محمد بن صالح العثيمين﴾یشم بەهەمانشێوە وەك خۆی کردۆتەوە بەکوردی و هەروەکو دەقەکە ئەگەر ناڕوونیەك هەبێت بەهەمان شێوەی ئەو ڕوونمکردۆتەوە و بەم جۆرەش جیامکردۆتەوە [ڕاڤەی شێخ ئیبن و عوسەیمین].

٤- بۆ تەحقیق و تەخریجی فەرموودەکانیش کاری مامۆستایەکی بەڕێزم بەناوی ﴿ أشرف بن عبدالمقصود ﴾ کەخەڵکی وولاتی میسرەو شەیخ ئیبن و عوسەیمین خۆی مۆڵەتی داوە بۆ ئەو کارەو چاپکردنی پەرتووکەکەی، وەئەم مامۆستایە زۆر کارێکی جوانی کردووە لە ڕووی تەحقیق و تەخریجی فەرموودەکانەوە و لەهەندێك شوێنیشدا توێژینەوەیەکی ڕێکوپێکی بۆ ئەوبابەتانی کردووە کە بەپێویستی زانیوە.

٥- کاری ئەو مامۆستایەم ﴿ أشرف بن عبدالمقصود ﴾ لەسەر ئەم پەرتووکە هەر بەزمانی عەرەبی وەکو خۆی هێناوە لەبەرگرنگیەکەی بەڵام ئەگەر پێویست بووبێت ئەوا وەرم گێڕاوەتە سەر زمانی شیرینی کوردی.

پێشەکی : م. عبدالرحمن حسين پور

## پێشەکی لێکۆڵەر

إن الحَمْدَ لله نَحْمَدُهُ وَ نَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوْذ بِاللهِ مِن شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ ... وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاّالله وَحْدَهُ لاشَرِيْكَ لَهُ ... وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

پاشان :

ئەوە پەرتوكی ﴿ شرح لمعة الإعتقاد لابن قدامة ﴾ ە دانراوی زانای پایەبەرز محمد بن صالح العثيمين لەبەرگێکی نوێدا پێشکەشی دەکەین بە برا موسڵمانەکانمان تا تیایدا دیمەنێکی گەشاوە ڕەنگاو ڕەنگ پوخت و بێگەرد ببینن سەبارەت بە بیروباوەڕی کۆمەڵی ڕزگاربو سەرکەوتو تارۆژی قیامەت کەئەوانیش ئەهلی سوننەت و جەماعەتن.

وەلە کاتێکدا گرنگترین شتێك کەپێویستمان پێی بێت بۆ ڕاستکردنەوەی بیروباوەڕ کەئەویش لە شوێنی بناغەیەکی پتەو و چەقیوە بۆ بنیادنانی کردەوە چاکەکان.

وەبەدڵنیاییەوە دانەر زۆربەی ئەم بیروباوەڕەی داناوە بە ڕۆیشتن لەسەر ڕێگەی پێشینە چاکەکان و پێشەوایانی فەرموودە ناس لەوبابەتەدا بۆیە دیبینی پەتوکەکەی پڕکردوە بەئایەتەکانی قورئان و دەقەکانی فەرمودەو گوتەی هاوەڵان و پێشەوا پایەبەرزەکان ڕەزاوڕەحمەتی خوایان لێ بێت.

بێگومان خۆیشی ڕەحمەتی خوای لێ بێت کەسێکی بیروباوەڕ باش و دروست بوە[1] زۆر بێگەردو خواپەرست بووە و لەسەر پەیڕو و یاسایی پێشین بووە[2] پێشەوا بووە لە زانست و کردەوە کردن بەزانستەکەیدا .

---

[1] عەمری کوڕی حاجیب بەو شێوەیە وەصفی کردووە هەروەکو لە ﴿سير أعلام النبلاء ١٦٧/٢٢﴾ دا هاتووە.

[2] ئیبن و نەجار بەوشێوەیە وەصفی کردووە هەروەکو لە ﴿الذيل على طبقات الحنابلة ١٣٥/٢﴾دا هاتووە.

ئەم بیروباوەڕە سەلامەتە کاریگەریەکی زۆری هەبووە لەژیانیدا تا لەبارەیەوە ووتـراوە ﴿هەرکەسێك ببینیێ وەك ئەوە وایە هەندێ لە هاوەڵانی بینیبێت ﴾[1], وە شێخی ئیـسلام إبن القـیّم لەپەرتووکەکـەی خۆیـدا ((إجتمـاع الجیـوش الإسـلامیة )) برِگەیـەکی لـەم بیروباوەڕە هێناوە بەم شێوەیە دەستی پێکردووە (( وتەی شێخی ئیسلام ﴿ موفق الـدین أبی محمد عبدالله بن أحمد المقدسی ﴾ کە هەموو لایەنەکان لەسـەر ڕازی بـوون پێی و بەگەورە دانانی و پێشەوایەتی ئەو یەك دەنگ و ڕێککەوتوون جگـە لـە جەهمیەکان و ئەوانەی سیفەتەکانی خوای گەورە پەکدەخەن))[2] قسەکەی تـەواو بوو.

وەلەبەر بایەخدان لە بلاوکردنـەوەی بیروبـاوەڕی ڕاسـت و دروسـت هەسـتاین بـە خوێندنی ئەم پەرتوکە لەمزگەوتەکەماندا بۆبرایانمان بەسوود وەرگرتن لە ڕاڤەکەی زانای پایەبـەرز محمـد بـن صـالح العثـیمین و پەرتووکـەکانی شـێخی ئیـسلام ئـیبن و تەیمییـەو قوتابیەکەی ئیبن و لقەییم و جگە لەوەش لەپەرتووکە دانراوەکان لەو بابەتەدا.

هەربۆیە هەنـدێ لـە برایانمـان پێـداگریان کـرد لەسـەرئەوەی هەسـتم بـە تـەخریجی فەرموودەکانی ئەم ڕاڤەیەو چاپکردنی لەگەڵ دەقەکەدا تا سـوودەکەی گـشتگیرتر بێـت جابۆیە بە پێشنیازێکی بەهێزمزانی و ئیستخارەم کردو داوام لەخوای گـەورە کـرد کـە یارمەتیم بدات و دەستم بەوکارەکرد، داوا لـەخوای بەرزوبـەرێز دەکـەم کەئـەم کـارە والێبکات تەنها لەبەر ڕەزامەندی خۆی بێـت وە سـوود بـە دانـەرو ڕاڤـەکارو ئـەوەی لەسەری نووسیوە و بلاوکەرەوەیی و خوێنەری و چاپکەری بگەیـەنێت,خـوای گـەورە دەفەرموویێت:﴿يَوۡمَ لَا يَنفَعُ مَالٞ وَلَا بَنُونَ ٨٨ إِلَّا مَنۡ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلۡبٖ سَلِيمٖ ٨٩﴾ الشعراء: ٨٨ - ٨٩

---

١ بێژەی ئەم وتەیە کوڕەزاکەی (إبن الجوزي)ە هەروەکو لە ( الذیل ١٣٤/٢)دا هاتووە.
٢ إجتماع الجیوش ص ١٩١.

وەباشترین وەصیەتیش وەصیەتی براکانی پێبکەم لەم شوێنەدا بریتیە لە وتەی خوای گەورە کەدەفەرمووێت: ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱللَّهُۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿٢٨٢﴾﴾ البقرة: ٢٨٢

ئای چەندە جوانە ئەو وتەیەی پێشەوا ئەوزاعی ڕەحمەتی خوای لێ بێت کەفەرموویەتی

﴿شوێن ڕێگەو ڕێبازی پێشین بکەوە ئەگەر چیش خەڵکی نەیانویستیت و وازیان لێهێنایت، وەئاگاداربە لە شوێنکەوتنی بۆچونی خەڵکی با بۆشت برازێننەوە بە قسە، لەبەرئەوەی بارودۆخەکە ڕوون دەبێتەوە و تۆ لەسەر ڕێگە ڕاستەکەیت﴾[1].

وەهەروەها دەفەرمووێت : ﴿ ئارام بگرە لەسەر سوننەت ﴾ مەبەستی لەوەیە کاتێ هەڵدەستی بە بەجێهێنانی سوننەتی پێغەمبەری نازدارS لەناو خەڵکیدا بە نامۆیی دەردەکەوی گوێ بەو نامۆییە مەدەو ئارام بگرە لەسەر نارەحەتی خەڵکی کەبەرەو ڕووت دەبێتەوە – وەرگێڕ﴾، وەلەو شوێنەی ئەوکۆمەڵە بەرێزە وەستاون تۆش بوەستە, وە ئەوە بڵێ کەئەوان ووتویانە ﴿ واتە : وەك ئەوان بدوێ لەبارەی کاروباری دینەوە– وەرگێڕ ﴾، وە وازلەو شتە بێنە ئەوان وازیان لێهێناوە (( واتە : ئەوەندە لەسەر شت مەدوێ و ڕۆمەچۆ چونکە هەرکەسێ زۆر ڕۆبچێ سەرئەنجامی گومڕاییە، لەوانەیە هەندێ شت هەبن نهێنیەکەی ڕوون نەبێت هەر بتەوێت بیزانیت ئەوا خۆت تووشی نارەحەتی

---

[1] أثر صحيح : أخرجه الخطيب في شرف أصحاب الحديث ص(٧) والآجري في الشريعة ص(٥٨) وعنه إبن عبدالبر في جامع بيان العلم وفضله (١٤٤/٢) من طريق العباس بن الوليد بن مزيد البيروتي قال : ( أخبرني أبي قال : سمعت أوزاعي يقول : فذكره).
وهذا إسناد صحيح . وأما قول الحافظ في التقريب (٣٩٩/١) عن العباس بن الوليد أنه صدوق فمتعقب، وقد وثقه إبن أبى حاتم والنسائي وإبن حبان وغيرهم كما في التهذيب (٥/ ١١٥,١١٦ ) والجرح والتعديل (٢١٦/٢) وطبقات الحنابلة (١/ ٢٣٥).
والاثر أورده الحافظ الذهبي في سير أعلام النبلاء (١٢٠/٧) وفي العلو للعي الغفار وصحح الالباني إسناده في مختصره للعلو ص(١٣٨).

دەکەیت و بەرەو تیاچوون دەچیت–وەرگێڕ ))، ڕێگەی پێشینە چاکاکانت بگرە بەر چونکە ئەوەی بۆ ئەوان گونجا بۆ تۆش دەگونجێت و لەناو ئەو ئاینە پیرۆزەدا جێت دەبێتەوە ﴾[1].

وەداوا لەخوای گەورە دەکەم کەزانستی بە سوودو کردەوەی چاك و وەرگێراومان پێ ببەخشێت، هەروەکو داوای لێدەکەین کە پەنامان بدات لەزانستێت کە خاوەنەکەی تەنها دەست بەتاڵی بۆ بمێنێتەوە و بێتە هۆی سەرشۆڕی بۆیی و لەگەردنی خاوەنەکەیشیدا کۆتێك بێت، وە داوای لێدەکەین کەمنەتی خۆیمان بەسەردا بڕێژێت تا بتوانین یەك خواناسی بەدی بهێنین بە زانست و کردەوە و بیروباوەڕو حاڵ و بارودۆخماندا، وە پەنای پێ دەگرین لەوەی کە بەشمان لەوەدا تەنها باسکردنی بێت و بەس .

**وحسبي اللّه ونِعم الوكيل، ولا حول ولا قوّة إلا باللّه العزيز الحكيم، ما شاء اللّه لا قوّة إلاَّ باللّه، توكلتُ على اللّه، اعتصمتُ باللّه، استعنتُ باللّه، وفوّضت أمري إلى اللّه، واستودعتُ اللّه ديني ونفسي ووالديّ وإخواني وأحبائي وسائر من أحسن إليّ وجميع المسلمين وجميع ما أنعم به عليّ وعليهم من أمور الآخرة والدنيا، فإنه سبحانه إذا استُودع شيئاً حفظه ونعم الحفيظ[2]**

وصلى الله وسلم وبارك على محمد وعلى آله وأصحابه والتابعين وسلم تسليما.

سُبْحانَكَ اللّهُمَّ وبِحَمْدِكَ، أشْهَدُ أنْ لا إلهَ إلاَّ أنْتَ، أسْتَغْفِرُكَ وأتُوبُ إلَيْكَ.

**مصر – مدينة الإسماعيلية**

**الجمعة – ٦ من رجب ١٤١٠هـ**

**أشرف بن عبدالمقصود بن عبدالرحيم**

---

١ رواه إسماعيل بن الفضل في الحجة في بيان المحجة بإسناد صحيح.
٢ الأذكار للنووي ص ( ٤٤ ) .

## ژیانی ئیبنو قودامەی مەقدیسی لەچەند دێڕێکدا

۩ ناو وڕەچەڵکی : ناوی موفق الدين باوکی محمد عبدالله کوڕی أحمد کوڕی محمد کوڕی قدامة کوڕی مقدام کوڕی نصر کوڕی عبدالله المقدسي, پاشان الدمشقي، الصالحي.

۩ لەدایکبوونی : لە مانگی شەعبانی ساڵی ٥٤١ کۆچی لە گوندی جەماعیل لە چیایی نابلس لەدایك بووە .

۩ پێگەیشتن و گەشتەکانی لەڕێگەی وەرگرتنی زانستدا : لەگەڵ خێزانەکەیدا هاتووەتە شام لەکاتێکدا تەمەنی ٢٠ساڵ بووە، پاشان قورئانی خوێندووە و کورتەی خیرەقی لەبەرکردووە .

لەگەڵ پورزاکەی کە ناوی ﴿الحافظ عبدالغني المقدسي﴾ لەساڵی ٥٦١ کۆچیدا گەشتیان کردووە بۆ بەغداد و لای زۆریك لە زانایانی ئەو شارە زۆر وانەیان خوێندوە.

زۆر زیرەك و تێگەیشتوو بووە تا بەسەر زۆرێك لەهاوەڵانیدا سەرکەوتووە و پلەیەکی بەرزی بەدەستهێناوە ولە کۆتایی دا شارەزاییەکی تەواوی لە مەزهەب و بنچینەکانیدا بەدەستهێناوە.

۩ لەخواترسان و بەکەم ڕازیبوونی : لەخواترس بووە، بەکەم ڕازی بووە، پارێزکاربووە، سیفەتی هێمنی و شکۆداری پێوە دیاربووە، وە نەرم و نیان و لەسەرخۆبووە، وە کاتەکانی تەرخانکراوبوو بۆ زانست و کردەوە کردن پێی، ئەم زانا پایەبەرزە لەکاتی ناکۆکیدا نەیارەکەی ڕەش دەکرد هەروەکو خەڵوز بەبەڵگەو پێسەلماندن، وەهیچ کات شەرم دای نەدەگرت و بێزارنەدەبوو، وە نەیارو دوژمنەکەشی هاواری دەکردو دەسوتا لەتاو بەهێزی ئەم زانابەڕێزەو بێ توانایی خۆی.

۵ مامۆستاکانی : ئیبن و قودامە ڕەحمەتی خوای لێ بێت زانستی لەسەر دەستی زۆرێك لەزانایان وەرگرتووە لە ناودارترینیان ﴿ تقي الدين أبو محمد عبدالغني المقدسي ٦١٢هـ﴾

وە شارەزای وڵاتی عێراق ئامۆژگاریکاری ئیسلام أبا الفتح نصر بن فتيان الشهير بابن المني.

۵ قوتابیەکانی : ئەم زانا پایە بەرزە ئێجگار قوتابی زۆر بووە لە بەناوبانگترینیان ﴿شهاب الدين أبوشامة المقدسي ٦٦٥هـ ﴾ وە ﴿ الحافظ زكي الدين أبو محمد المنذري ٦٥٦هـ ﴾ وە جگە لەوانەش.

۵ وتەی زانایان لەبارەی ئەم زانا پایە بەرزەوە :

- أبو عمر بن الصلاح فەرموویەتی : ﴿ نمونەی شێخ موەفەقم نەدیوە ﴾.
- إبن تيمية فەرموویەتی : ﴿ لەدوای پێشەوا ئەوزاعی کەس نەهاتۆتە شام بەئەندازەی شێخ موەفەق زاناو تێگەیشتوو بێت ﴾.
- ئیَشەوا مونزیری فەرموویەتی : ﴿ فەقیهو پێشەوا، لە شاری دیمەشقدا هەڵکەوت، وانەی ووتوەتەوە و فەتوای داوە، لە فیقهو جگە لەوەش پەرتووکی داناوە لەپەرتووکی کورت ( بچوك ) و فراوان .
- ئیَشەوا زەهەبی فەرموویەتی : ﴿ یەکێکە لەگەورەترین زانا گەورەکان، کە خاوەنی چەند پەرتووکە کە دایناوە لەبوارە جۆراو جۆرەکاندا ﴾
- ئیبن و کەسیر فەرموویەتی : ﴿ شێخی ئیسلام، زاناو پێشەوا، لێهاتوو، لەسەردەمی ئەو و پێش ئەو ماوەیەش کەسێ نیە لەو تێگەیشتوو تربێت ﴾.

🕯 بەرهەمەکانی

پێشەوا موەفەق برێکی زۆر دانراوی هەیە کە جێگەی ڕەزامەندی لای زانایانە:

ئیبن و ڕەجەب دەفەرمووێت :﴿ پێشەوا موەفەق ژمارەیەکی زۆر دانراوی باشی لە مەزهەبدا داناوە لەئەصل و فەرعی، وەهەروەها لەبوارەکانی فەرموودەو زمان و دونیا نەویستی و لەخوا ترساندا، وەدانراوەکانی لەبواری بیروباوەڕدا لەوپەڕی جوانی و چاکیدایە، زۆربەیان لەسەر ڕێرەوی فەرموودەناسانە پڕە لەفەرموودەو وتەی پێشینە چاکەکان کەهەموویان بە سەنەدو ڕشتەوە هێناونی، هەروەکو چۆن ئەوە ڕێگەو ڕێبازی پێشەوا ئەحمەدو پێشەوایانی فەرموودەیە﴾ تەواو.

لەم بەرهەمانەش:

١. لەفیقهدا : المغني، والكافي، والعدة، والعمدة، والمقنع .....

٢. لە بیروباوەڕدا : لمعة الإعتقاد، القدر، ذم التأويل ......

٣. لە ئوصولی فیقهدا : روضة الناظر.

٤. لەدونیا نەویستی و خواناسیدا : الرقة والبكاء، والتوابين.

٥. لەفەرموودەشدا : مختصر علل الحديث للخلال.

جگە لەوانەش لەبەرهەمەکان کەهەیانە لەچاپ دراوە و هەشیانە هێشتا دەست نووسە، داوا لە خوا دەکەین کەبەم نزیکانە چاپ بن و ڕۆشنایی ببینن[1].

---

[1] بۆ زیاتر شارەزابوون لەژیانی ئەم زانا پایەبەرزە لەخوا ترسە دەتوانیت بگەڕێتەوە بۆ:

- التكملة في وفيات النقلة للمنذري ( ٣/ ١٠٧ ).
- تاريخ الإسلام للذهبي الطبقة الثانية والستون مؤسسة الرسالة ترجمة رقم ( ٦٦٩ ).
- العبر في خبر من غبر للذهبي ( ٥/ ٧٩-٨٠ ).
- سير أعلام النبلاء للذهبي ( ٢٢/ ١٦٥-١٧٣ ).
- البداية والنهاية لابن كثير ( ١٣/ ٩٩-١٠٠ ).
- ذيل طبقات الحنابلة لابن رجب ( ٢/ ١٣٣-١٤٩ ).
- شذرات الذهب لابن العماد المنبلي ( ٥/ ٨٨-٩٢ ).
- معجم البلدان لياقوت الحموي ( ٢/ ١٥٩ ٩.
- فوات الوفيات لابن الشكر الكتبي ( ٢/ ١٥٨-١٥٩ ).
- فهرس مخطوطات الظاهرية ( قسم الحديث ) للشيخ الألباني .
- مقدمة تحقيق كتاب إثبات صفة العلو لابن قدامة بقلم بدر البدر.

باسی بەرهەمەکانی ئیبنو قودامە لەبواری بیروباوەڕدا

الحافظ ئیبن و ڕەجەب لەپەرتووکی ﴿ذیل طبقات الحنابلة لابن رجب ( ٢/ ١٣٩﴾دا دەفەرمووێت : پێشەوا موەفەق ژمارەیەکی زۆر دانراوی باشی لە مەزهەبدا داناوە لەئەصل و فەرعی، وەهەروەها لەبوارەکانی فەرموودەو زمان و دونیا نەویستی و لەخوا ترساندا .

وەدانراوەکانی لەبواری بیروباوەڕدا لەوپەڕی جوانی و چاکیدایە، زۆربەیان لەسەر ڕێڕەوی فەرموودەناسانە پڕە لەفەرموودەو وتەی پێشینە چاکەکان کەهەموویان بە سەنەدو ڕشتەوە هێناونی، هەروەکو چۆن ئەوە ڕێگەو ڕێبازی پێشەوا ئەحمەدو پێشەوایانی فەرموودەیە، باوەڕی بەوە نەبوو کە ڕۆبچێت لەگەڵ ئەهلی کەلامدا لەبابەتە وردەکاندا، ئەگەر چی بۆ ڕەددانەوەشیان بووایە وئەمەش ڕێبازی پێشەوا ئەحمەدو زانا پێشینەکانە.

وە ئەم زانا بەڕێزە زۆر بەدواداچوونی بۆ ئەو دەقانە دەکرد کە وەرگیرابوون لەبواری بیروباوەڕو جگەلەوەشدا، حەزی بەرەهایی ئەوەی کاریگەری نیە لەدەستەواژەکان نەدەکرد، وەهەردەم فەرمانی بەجێگیرکردن و تێپەڕاندن دەکرد لەبارەی ئەودەقانەی هاتووە لەبواری صیفەتەکانی خوای گەورەدا، بێ ئەوەی هیچ شیکردنەوە و ڕاڤەو چۆنیەتیەکی بۆ دابنێت، وە بێ ئەوەی وێنەی بۆدابنێ یان گۆڕانکاری تیادا بکات، وە یان ماناکەی لەڕاستی خۆی لابدات و بیگۆڕێ یان واتا ڕاستیەکەی خۆی پەکبخات.

## لە بەرهەمەكانی لەبنچینەی ئایندا ﴿ بیروباوەڕ﴾:

١. البرهان في مسألة القرآن. جزء[١]

٢. جواب مسألة وردت من صرخد [٢] في القرآن. جزء

٣. الإعتقاد[٣] . جزء

٤. مسألة العلو[٤] . جزآن

٥. ذم التأويل [٥]. جزء

٦. كتاب القدر [٦]. جزآن

٧. فضائل الصحابة . جزآن، وابزانم كە پەرتووكی ﴿ منهاج القاصدين في فضل الخلفاء الراشدين ﴾ بێت[٧]

٨. رسالة إلى الشيخ فخرالدين بن تيمية في تخليد أهل البدع في النار[٨].

٩. مسألة في تحريم النظر في كتب أهل البدع. تەواو.

---

١ نشر في مجلة البحوث الإسلامية العدد (١٩) والتى تصدر عن دار الإفتاء بالرياض . بتحقيق د. سعود بن عبدالله الغنيسان.

٢ صرخد :گوندێكە لە گوندەكانی شام لە نزیك حۆران، بەهەمان شێوە ئیبن عیماد باسی ئەم پەرتووكەیشی كردووە .

٣ كەئەویش ئەم پەرتووكەیە ئێمە لەخزمەتیداین و هەڵدەستین بەلەسەر نووسینی ڕاڤەكەی . وەبێگومان ابن شاكر وەالذهبي وە ابن العمان بەهەمان ئەو ناوە ناویان بردووە.

٤ طبع سنة ١٣٢٢هجري في مطبعة مجلة المنار بمصر، وأعيد طبعه محققا على عدة نسخ خطية بالدار السلفية بتحقيق بدر البدر وقد نقل الحافظ إبن القَّيم منه فقرة في كتابه إجتماع الجيوش ص(٨٧).

٥ طبع ضمن مجموعة إعتقاد السلف تحقيق النشار والطالبي . طبعة منشاة المعارف وكذا بتحقيق بدر البدر.

٦ ذكره الذهبي أيضا وكذا إبن شاكر.

٧ ذكره الذهبي وإبن العماد.

٨ ذكره إبن العماد.

پاشـان دوای نـاو هێنـانی ئـەوەی کـەماوە لەپەرتووکـەکانی فـەرمووی :﴿ هـەموو موسڵمانان بەگشت بەبەرهەمەکانی زانای پایە بەرز سود مەند بوون، وە شـوێنکەوتوانی مەزهەب بەتایبەتی . وە بڵاو بوویەوە و نـاوی دەرکـرد بـەهۆی باشـی مەبەسـتەکەیی و دڵسۆزی لە دانانیدا[1] .تەواو.

[1] وەهەروەها لەبەرهەمەکانی زانای پایەبەرز لەبواری بیروباوەڕدا:

- حكاية المناظرة في القرآن أو المناظرة لأهل البدع في القرآن.طبع بتحقيق الأخ عبدالله بـن يوسـف كرمه الله.
- ذم ما عليه مدَّعو التصوف . طبع ضمن مجموعة من دفائن الكنـوز بتحقيـق الـشيخ محمـد حامـد الفقي رحمه الله
- الصراط المستقيم في بيان الحرف القديم . قال محقيق كتاب البرهان في بيان القرآن لابـن قدامـة : (( جزء لم يطبع وهو موجود عندى أرجو أن أُوفق في إخراجه إن بقي في العمر بقية)).

## پوختەیەك لەژیانی زانای پایەبەرز ﴿محمد بن صالح العثيمين﴾ وەبەرهەمەكانی لەبواری بیروباوەڕدا

ﯠ ڕەچەڵەكی : ﴿ناوی أبو عبدالله محمدی كوڕی صاڵحی كوڕی محمدی كوڕی عثيمين الوهيي التميمي﴾ە.

ﯠ لەدایكبوونی : لەشاری عونەیزە لە ٢٧ی ڕەمەزانی پیرۆزی ساڵی ١٣٤٧هـ لەدایكبووە .

ﯠ پێگەیشتنی: قورئانی پیرۆزی لای باپیری واتا باوكی دایكی كەناوی ﴿عبدالرحمن ی كوڕی سولەیمانی ئال دامغ﴾ بووە خوێندووە و لەبەركردووە،پاش ئەوە ڕووی كردۆتە فێربوونی زانست و فێری نووسین و ژمێریاری و هەندیك هونەری ئاداب بووە.

لەو كاتەدا زانای گەورە عبدالرحمن كوڕی ناصر سەعدی دووان لەفێرخوازانی زانستی شەرعی لای خۆی دانابوو تا وانە بە فێرخوازە بچوكەكان بلێنەوە كە یەكێكیان عەلی صالحی و ئەویتریان محمدی كوڕی عبدالعزیزی مطوع بوو ڕەحمەتی خوایان لێ بێت، هەریەكە لە پوختەی بیروباوەڕی الواسطية كەدانراوی شێخ عبدالرحمن كوڕی ناصر سەعدی خۆی بوو وە منهاج السالكين لە فیقهدا كەبەهەمان شێوە دانراوی شێخ عبدالرحمن كوڕی ناصر سەعدی بوو لەگەڵ الاجرومية و الألفية لای ئەو زانا پایەبەرزە خوێندووە، وەهەروەها لای شێخ عبدالرحمن ی كوڕی علی كوڕی عودان زانستی میرات و فیقهی خوێندووە.

وە هەرلای شێخ عبدالرحمن كوڕی ناصر سەعدی كە دادەنرێت بەمامۆستای یەكەمی و لای ماوەتەوە زانستەكانی ﴿ یەكخواناسی و تەفسیرو فەرموودەو فیقهو ئوصولی فیقهو میرات و زاراوەی فەرموودەو نەحو صەرفی ﴾ خوێندووە .

وە لای زانای پایەبەرز شێخ عبدالعزیز بن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت كەدادەنرێت بەمامۆستای دووەمی دەستی كرد بەخوێندنی صەحیحی بوخاری و هەندێ لەنامەكانی شێخی ئیسلام ئیبن و تەیمیە و هەندێ لەپەرتووكە فیقهیەكانی خوێندووە .

## بەروپێشچوونی لەوەرگرتنی زانست و هەوڵەکانی لەبواری بانگەوازدا:

لەساڵی ١٣٧١ دا لەمزگەوتدا دانیشت بۆ وانە ووتنەوە و هەرلەگەڵ کردنەوەی پەیمانگا زانستیەکاندا لەشاری ڕیاز لەساڵی ١٣٧٢ پەیوەندی پێوە کردوو پاش دوو ساڵ تەواوی کردوو دیاری کرا بە وانە بێژ لە پەیمانگای زانستی شاری عونێزە لەگەڵ بەردەوامبوونی لەخوێندن لەزانکۆدا بەشێوە تەنسیب لە کۆلێژی شەریعەت و لەگەڵ ئەوەشدا هەر بەردەوام بوو لەوەرگرتنی زانست لەسەردەستی زانای پایەبەرز شێخ عبدالرحمن کوڕی ناصر سەعدی ڕەحمەتی خوای لێ بێت .

لەکاتێکدا زانای پایەبەرز شێخ عبدالرحمن کوڕی ناصر سەعدی ڕەحمەتی خوای لێ بێت مرد ئیمامەتی مزگەوتی گەورەی شاری عونێزەی گرتەدەست، وە وانەی لە هەریەك لە قوتابخانەی عونێزەی نیشتیمانی و پەیمانگای زانستیدا دەوتەوە پاشان گوێزرایەوە بۆ وانە ووتنەوە لەهەردوو کۆلێژی شەریعەت و ئوصولی دین لقی زانکۆی ئیمام محمدی کوڕی سعودی ئیسلامی لەقەصیم جگە لەوەی کەلەهەمان کاتدا ئەندامی دەستەی گەورە زانایان بوو لە سعودییە ڕەحمەتی خوای پەروەردگاری لێ بێت.

وەهەروەها شێخ عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت زۆر چالاك بوو لەبواری بانگەواز و چاوڕۆشن کردنەوەی موسڵمانانداا، هەموو خەڵکی دەیان ناسی لەڕێگەی وانە بەسوودەکانیەوە و ووتارە جوانەکانیەوە کەپێشکەشی دەکردن لە مزگەتی گەورەی عونێزە، وەلەو وانانەی کەلەڕۆژانی دەی کۆتای مانگی ڕەمەزانی هەموو ساڵێکدا لەمزگەتی حەرام پێشکەشی دەکرد، وەلەڕێگەی فەتوا پتەوەکانیەوە کەپێشکەشی هەموو موسڵمانانی جیهانی دەکرد لەکاتی مەراسیمی حەجدا وە لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا وە لەبەرنامەی ﴿ نور علی درب ﴾ کە پێشکەش دەکرا لە ڕادیۆوە وە لەڕێگەی ئاڵوگۆڕکردنی نامەکانیەوە کەلەگەڵ زۆرێك لەفێرخوازان و زانایاندا هەیبوو...هتد، وە ئەو هەموو پرسیارەی کەڕۆژانە ڕووبەڕووی دەکرایەوە و بە وەڵامی تەواو کامڵ وەڵامی دەدایەوە.

## بەرهەمەكانی لە بواری بیروباوەڕدا:

وەهەروەها شێخ عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت ژمارەیەكی زۆر دانراوی بەپێزی هەیە كە خەڵكی سوودی لێ بینیون لە هەریەك لەبوارەكانی ﴿ بیروباوەڕو فیقهو ئوصولی فیقهو ئامۆژگاری و ڕێنمایی و بانگەوازدا ﴾ كە ژمارەیەكی زۆر لەوانە لە وەزارەتی مەعارفی سعودی بە وانە دەخوێندرێن.

ئێمە لێرەدا ئەوەی پەیوەندی بە بیروباوەڕەوە هەیە باسی دەكەین :

١. فتح رب البرية بتلخيص الحموية كە ئەمە یەكەم پەرتووكی چاپكراوی (شێخ عثیمین )ە كەلە ٨ی ذي القعدة ی ساڵی ١٣٨٠ تەواوی كردوو لە چوارچێوەی كۆمەڵە نامەكاندا لەبیروباوەڕدا چاپخانەی مكتبة المعارف لەڕیاز چاپی كردووە.

٢. پوختەیەك لەبیروباوەڕی ئیسلامی : شێخ عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت لەم پەرتووكەدا شەش پایەكەی باوەڕی بەشێوازێكی زۆر ئاسان ڕاڤەكردووە وئەم نامەیە دادەنرێت بەپڕۆگرامی قۆناغی سێیەمی ناوەندی لەپەیمانگا زانستیەكاندا لە وڵاتی سعودیە لەبواری یەكخواناسیدا . ئەم بەرهەمەش هەروەكو ئەوەی پێشوتر لە چوارچێوەی كۆمەڵە نامەكاندا لەبیروباوەڕدا چاپخانەی مكتبة المعارف لەڕیاز چاپی كردووە.

٣. القواعد المثلى في صفات الله وأسمائه الحسنى : كەئەویش لەجوانترین پەرتووكەكانی شێخ عثیمینە ڕەحمەتی خوای لێ بێت، سوپاس بۆخوا هەستاوین بەتەخریج و لەسەرنووسینی ئەم پەرتووكەو لەچاپدراوە.

٤. ڕاڤەی لمعة الإعتقاد الهادي إلى سبيل الرَّشاد لابن قدامة: ئەوەش ئەم پەرتوكەی بەردەستمانەو كراوە بەبابەتی ساڵی یەكەمی ناوەندی لەبواری یەكخواناسیدا لە پەیمانگا زانستیەكاندا.

٥. بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت : كە تیایدا كورتەو پوختەیەكی لەبیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەتی باسكردووە كەئەویش لە بڵاوكراوەكانی زانكۆی ئیسلامیە لە مەدینەی مونەوەرە.

٦. ڕاڤەی العقيدة الواسطية لابن تيمية : كەئەویش بابەتی ساڵی دووەمی ناوەندییە لەبواری یەكخواناسیدا لە پەیمانگا زانستیەكاندا.چاپكراوەو دەست دەكەوێت.

٧. تەفسیری آية الكرسي : ئەم تەفسیرە دادەنرێت بە جیاكەرەوەیەكی زۆر جوان لە قسەكانی شێخ لەبواری ناو سیفەتەكانی خوای گەورەدا. چاپكراوەو دەست دەكەوێت.

٨. نامەیەك لە گەیشتن بەمانگ و چوونە سەری . كەئەویش چاپكراوە لە چوارچێوە كۆمەڵە نامەكاندا لەبیروباوەڕدا.

**٩. ئەمانەی باسكران جگە لە فەتواكانی شێخ عثیمینە ڕەحمەتی خوای لێ بێت لەبواری بیروباوەڕدا كە چەندان جار چاپكراوە لەچوارچێوەی پەرتووكی فەتواكانیدا، وە بەرهەمەكانیشی لە گۆڤارو ڕۆژنامەكاندا.[1]**

---

[1] ئەوەی پێویستە بوترێت ئەوەیە كە زانای پایەبەرز تا مرد لە وانە وتنەوە و نوسین و فێربوون و فێركردن نەوەستا بۆیە زەحمەتە بتوانرێت پەرتووكەكانی شێخ دیاری بكرێت و بوترێت ئەوەندە پەرتووكەی هەیە، لەبەرئەوەی ئەم زانا خواناسە هەرچی بابەتێكی وتبێتەوە لەلایەن فێرخوازانەوە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دەنوسرێنەوە و دەكرێنە پەرتووكی نوێ، خوای پەروەردگار خۆی بەرەكەتی ڕشتوە بەسەر تەمەنی ئەم زانایەدا و بەرهەمی زۆرەو موسڵمانان قەرزاری ئەم پیاوە بەڕێزەن بۆیە داوا لەفێرخوازانی زانست دەكەم بەگوێرەی توانای خۆیان هەستن بەخزمەتكردنی و پەرتووكەكانی وەربگێڕنە سەر زمانی شیرینی كوردی تا موسڵمانانی كوردستانیش بتوانن زیاتر سوود لەبەرهەمەكانی بینن، سوپاس بۆ خوا لەلایەن فێرخوازە ئازیزەكانەوە هەست بەمە كراوە بۆ یە هەست دەكەین هێواش هێواش بەهەمەكانی دەكرێنەوە بەكوردی و ئێمەی شوێنكەوتەی قورئان و سوننەت لەهەموو كەس زیاتر دەبێت خزمەت بە زانا سەلەفیەكان بكەین بەتایبەتی ئەم زانا بەڕێزەو هاوبیروڕاكانی وەكو شێخ ئبن باز و پێشەوا ئەلبانی و شێخ صالح فەوزان هەموو ئەوانەی تریش كە پێشەوای ئەم بانگەوازە پیرۆزەن كە بانگەوازی سەلەفییەتە و لەهەرشوێنێك بڵاوبێتەوە ئەو شوێنە ڕزگاری دەبێت لە گۆڕپەرستی و هاوبەش بۆخوا دانان و بیدعەو خورافەت و درۆو دەلەسەو چاڵ بۆ خەڵك هەڵكەندن و ڕەوانە كردنیان بۆ ئاگری دۆزەخ، بۆیە ئامۆژگاری خۆم دەكەم پێش تۆ ئەی موسڵمانی بەڕێزو خوێنەری دڵسۆز ئەگەر دەتوانی هەستیت بەوەرگێڕانی بەرهەمی زانا سەلەفیەكان ئەوا چیدی مەوەستەو قۆڵی مەردایەتی لێ هەڵبكەو دەست بكە بەوەرگێڕانی بەرهەمە موبارەكەكانیان تا چاوی خەڵكی پێ ڕۆشن بكەیتەوە، وەئەگەر ئەو توانایەت نیە ئەوا بەماڵەكەت خزمەت بە بانگەوازی سەلەفیەت بكەو بڕێكی زۆر لەپەرتووكەكانیان بەسەر خەڵكیدا دابەش بكەو ئامۆژگاریان بكە بیخوێننەوە و چووی بۆ هەرشوێنێ ئاوەدانی بكەوە بە بردنی هەندێ لەو بەرهەمانەی دڵنیایت سەلەفیە ئیتر ئەوەی تری بدە دەست خوای گەورە خۆی دینی خۆی سەردەخات و بڵاودەبێتەوە بەڵام ئێمە هیچ نەكەین هەر گلەیی لەخەڵكی بكەین و بڵێین خەڵكی دینی ناوێ ئەوە باش نیە بەڵكو ئەوەی لەسەر من و تۆی بانگخوازە گەیاندنی ئەم بانگەوازە پیرۆزەیە بەهەموو شوێنێ تا چیتر شوێنكەوتووانی شەیتان و گۆڕپەرستان و فێڵبازەكان و بیدعەچیەكان خەڵكی لەوە زیاتر گومڕاتر نەكەن، خوای گەورە منیش و تۆش سەرفرازی دونیاو دوارۆژ بكات و بمانگێڕی لەو كەسانەی شەرەفی بانگەوازیكردنیان پێ دەبەخشرێت بۆلای خوای پەروەردگارو ئاینە ڕاست و دروستەكەی وەڕوومان هەبێت لەڕۆژی دوایدا سەربەرزبكەینەوە و بڵێین ئێمەی سەلەفی بەڕاستی تا كۆمەڵ بووین كە خوای گەورە هەڵیبژاردین بۆ ئەو ئەركە قورسە كە خاوێن كردنەوەی بیروباوەڕی خەڵكی بوو لەبیروبۆچوونە بێ باوەڕی و گومڕاكان, ئەوەش پێویستی بەماندووبوونە و شەونخونی هەیە چونكە ئەم كوردستانەی ئێمە گیری خواردووە بەدەست كۆمەڵێ كەسی دەروون نەخۆشی هەواو ئارەزوو پەرستی هاوبەش پەیداكەری بیدعەچی نەفامەوە كە خۆیان بەجێنشینی پێغەمبەر S دەزانن و بەئارەزووی خۆیان ئاینەكەی خوایان گۆڕیوەو لەوپێناوەشدا ئامادەن هەموو شتێ بكەن تا ئەو پێگەیەی لەدەستیاندایە كە میحرابی مزگەوتەكانە لەدەستیان نەچێت چونكە ئەگەر لەدەستیان چوو ئەوا خەڵكی ئەوانی بۆ دەردەكەوێت و شوێنیان ناكەون و بەگوێیان ناكەن، بۆیە وامەزانە بانگەواز كردن بۆ ڕێبازی پیرۆزی سەلەفییەت هەروا ئاسانە بەڵكو دەبێت پشت بە خوای گەورە ببەستی لەتەواوی كارەكانتا بەتایبەتی لەكاری بانگەوازی كردن بۆلای خوای گەورەو ئاینە دوور لە شیرك و بیدعەكەی – وەرگێڕ .

# ڕاڤەی پەرتووکی

# ﴿ لمعة الإعتقاد الهادي إلى سبيل الرَّشاد ﴾

دانراوی پێشەوا

﴿موفق الدين أبی محمد عبدالله بن أحمد بن محمد بن قدامه المقدسی ﴾

لەلایەن پێشەوا

﴿ محمد بن صالح العثيمين ﴾

وەرگێڕانی

﴿ ئاکۆ جلیل کریم ﴾

پێداچوونەوە و پێشەکی بۆ نووسینی

د. عبداللطيف أحمد مصطفى

م. عبدالرحمن حسين پور

لێکۆڵینەوە و تەخریجی فەرمودەکانی لەلایەن

﴿ أشرف بن عبدالمقصود بن عبدالرحيم ﴾ەوە بۆکراوە

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی ڕاڤەکار: محمد بن صالح العثيمين

الحَمْدَ لله نَحْمَدُهُ وَ نَستَعِيْنُهُ وَنَستَغْفِرُهُ ونتوبُ إليه وَنَعُوْذُ بِاللهِ مِن شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ ... وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاّاللهُ وَحْدَهُ لاشَرِيْكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ صلى الله عليه وعلى آله وأصحابه ومن تبعهم بإحسان وسلم تسليما كثيرا.

لەپاشاندا : ئەوە لەسەر نووسینێکی کورتە لەسەر پەرتووکی ﴿ لمعة الإعتقاد ﴾کە ﴿أبو محمد عبدالله بن أحمد بن قدامە المقدسی ﴾ داینـاوە، لەسالّی ٥٤١هـ لە گوندی جەماعیل لە چیایی نابلس لەدایك بووە، وە لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزانی سالّی ٦٢٠هـ لەدیمەشق مردووە ڕەحمەتی خوای گەورەی لیّ بێت.

وە ئەو پەرتووکە دانەری تیایدا پوختەی بیروباوەڕی کۆکردووەتەوە و لەبەرئەوەش سەرۆکایەتی پەیمانگا زانستیەکان بڕیاری دا کەلەسالّی یەکەمی بەشی ناوەندیدا بخوێندرێت تا ببێتە پالّپشتێك و لەم قۆناغەدا پشتی پیّ ببەسترێت، وەلەبەرگرنگی پەرتووکەکە لەڕووی بابەت و بەرنامەیەوە و نەبوونی ڕاڤەیەك بۆی لەبەرئەوە پشتیوان بەخوای گەورە و داوام لێی کە ڕاستیم پیّ ببەخشێت لەوتەو کردەوەمدا بڕیارم دا کە چەند وشەیەکی سادە و ئاسان لەسەری بنووسم تا بەهۆیەوە نهێنیەکانی بدۆزرێتەوە و سەرچاوەکانی ڕوونبکرێتەوە و سوودەکانی دەربخرێت، داوام لە خوای گەورەیە نەمداتە دەستی خۆم بۆ چاوتروکاندنێك و یارمەتیم بدات بەیارمەتیدانی خۆی و سەرکەوتووم بکات، وە پیرۆزی ببەخشێت بەکارەکەم و سوود بەخشی بکات چونکە هەر خۆی بەخشەرو بەرێزە.

محمد بن صالح العثيمين نووسراوە لە ١٠-١-١٣٩٢هـ

## چەند بنەمایەکی گرنگ لەبابەتی ناو و سیفەتەکانی خوای گەورەدا

پێش چوونە ناو کرۆکی پەرتووکەکە پێم خۆشە لە پێشدا چەند بنەمایەکی گرنگ باس بکەم لەوەی پەیوەندی دارە بە ناو و سیفەتەکانی خوای گەورەوە[١] :

### بنەمای یەکەم:

لەوەی پێویستە بەرامبەر قورئان و سوننەت لەناوەکانی خوای گەورە و سیفەتەکانیدا:

ئەوەی پێویستە لەسەرمان بەرامبەر دەقەکانی قورئان و سوننەت هێشتنەوەی بەڵگەکانیەتی لەسەر ڕووکەشی خۆی بەبێ گۆڕین لەبەرئەوەی خوای گەورە قورئانی بە زوبانێکی عەرەبی ڕوون و پاراو ناردۆتە خوارەوە، وە پێغەمبەریش صلى الله عليه وعلى آله وسلم بەهەمان شێوە بە زوبانی عەرەبی قسەدەکات لەبەرئەوە پێویستە هێشتنەوەی بەڵگەیەتی قسەی خواو قسەی پێغەمبەرەکەی صلى الله عليه وعلى آله وسلم لەسەر ئەوەی کەهەیەو بەڵگەیە لەو زوبانەدا، وەلەبەرئەوەی گۆڕینی لەو ڕووکەشەی کەهەیەتی قسەکردنە لەسەر خوا بەبێ بوونی زانست لەو بوارەدا کەئەوەش حەرامە و قەدەغەیە لەبەر فەرمایشتی خوای گەورە کە دەفەرموێت : ﴿ قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلْإِثْمَ وَٱلْبَغْيَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُوا۟ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾ الأعراف: ٣٣

---

١ بۆزانیاریت زانای پایەبەرز پەرتووکێکی زۆر جوانی هەیە دەربارەی ناو و سیفەتەکانی خوای گەورە کەتیایدا ژمارەیەك لەبنەما گرنگەکانی تیادا باس کردووە دەربارەی ئەو بابەتەی باسکرا، وە ئێمە هەستاوین بە توێژینەوەیی و ناسراوە بە ﴿ القواعد المثلى في صفات الله وأسمائه الحسنى ﴾ کەزۆر جێگەی گرنگی پێدان و خوێندنەوەیەتی.

واتە : ﴿ بڵێ ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم پەروەردگارم هەرکاری خراپ و دزێوو ناشیرینی حەرامکردووە، ئاشکراو نهێنی و هەروەها تاوان و گوناە و لەسنوردەرچوون و دەستدرێژی کردن بۆ سەر خەڵك بەناهەق و بێ هیچ بەڵگەیەکی خوایی، شەریك و هاوبەش دانێن بۆ خوا و لەئاخاوتن و قسەکردن دەربارەی خوا بەبێ زانین و بەبێ بەڵگە درۆ هەڵبەستن ﴾

نمونەی ئەوەش وەکو خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَآءُ ﴾ المائدة: ٦٤ واتە :﴿ بەڵکو هەردوو دەستی خودا هەمیشەو بەردەوام کراوەیە هەرچۆنێك خۆی بیەوێ دەیبەخشێت ﴾

چونکە ڕوکەشی ئایەتەکە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە خوای گەورە دوو دەستی ڕاستەقینەی هەیە جابۆیە پێویستە جێگیرکردنی ئەو سیفەتە بۆیی و دانپێدانانی، جائەگەر کەسێ وتی مەبەست پێیان ﴿ هێزە – واتە هێزی خوای گەورە ﴾ پێی دەڵێین ئەوە هەڵگەڕاندنەوەیە بۆ قسەکەی خوا لە ڕوکەشەکەی خۆی لەبەرئەوەش دروست نیە ئەو قسەیە بکرێت و بوترێت چونکە ئەوە قسەکردنە دەربارەی خوا و لەسەر خوا بێ بوونی زانین .

## بنەمای دووەم :

لەبارەی ناوەکانی خوای گەورەوەیە، وەلەژێر ئەم بنەمایەدا چەند لقێك هەیە:

● لقی یەکەم : ناوەکانی خوای گەورە هەرهەمووی جوانن : واتە لەجوانیدا بێ وێنەیەو گەیشتۆتە ئەو پەڕی جوانی, لەبەرئەوەی هەرچی سیفەتێکی تەواو هەیە گرتویەتیە خۆی کە هیچ کەم و کورتیەکی تێدا نیە لە هیچ ڕوویەکەوە لەڕووەکانەوە : خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴾ الأعراف: ١٨٠ واتە ﴿ ناوەکانی خوای گەورە هەر هەمووی جوانن ﴾

نمونەی ئەوە : ناوی ﴿ الرحمن ﴾ بریتیە لەناوێك لەناوەکانی خوای گەورە، بەڵگەیە لەسەر سیفەتێکی گەورە کەئەویش بەزەیی فراوانە، لەوە وە دەزانین کە یەکێك نیە لەناوەکانی خوای گەورە ﴿ الدهر ﴾ لەبەرئەوەی ﴿ الدهر﴾ واتایەك ناگرێتە خۆی بگاتە ئەو پەڕی جوانی، هەرچی دەربارەی فەرمودەکەی پێغەمبەریشە صلى الله عليه وعلى آله وسلم کەدەفەرموێت ﴿لاتسبوا الدهر فان الله هو الدهر﴾[1] واتە ﴿ جنێو مەدەن بە ڕۆژگار لەبەرئەوەی خوای گەورە خۆی ڕۆژگارە﴾[2] جا واتاکەی بریتیە لە خاوەنی الدهر کە بەئارەزووی خۆی کاری تێدا دەکات و هەڵیدەسوڕێنێت بەبەڵگەی فەرمودەکەی تری صلى الله عليه وعلى آله وسلم کەدەفەرموێت لە گێڕانەوەیەکی تردا لە خواوە کە دەفەرموێت : ﴿بِيَدِيَ الأَمْرُ ، أُقَلِّبُ اللَّيْلَ وَالنَّهَار ﴾[3] واتە ﴿ هەموو کارو بارێ بەدەستی منە، چۆنم بوێ هەڵیدەگێڕمەوە﴾[4]

١ مسلم : كتاب الألفاظ من الأدب : باب النهي عن سب الدهر ( ٢٢٤٦ ) (٥) من حديث أبي هريرة – رضى الله عنه – وقال الحافظ في الفتح ( ١٠ / ٥٦٥ ) : (( وأخرجه أحمد من وجه أخر عن أبي هريرة بلفظ (( لاتسبوا الدهر فإن الله تعالى قال : أنا الدهر، الأيام والليالي لي أجددها وأبليها وآتي بملوك بعد ملوك )) وسنده صحيح )) أ.هـ.

٢ زانای پایە بەرز إبن القيم لە پەرتووکەکەیدا زادالمعاد ( ٢/٣٥٥ )دا فەرمویەتی : ﴿ ئەو کەسەی جنێو بە الدهر دەدات لەنێوان دوو باورِدۆخدایە کە هەر بێگومان یەکێکیانی تێدایە : یان ئەوەتا جنێودانەکەی بۆ خودایە، یان هاوبەشی بۆ داناوە، لەبەرئەوەی ئەو کەسە ئەگەر باوەڕی وابێت کەخوای گەورە خۆی بەتەنها ئەو کارەی کردووە و ئەویش جنێو بەوە دەدات کەئەوەی کردووە ئەوا بێ گومان جنێوی بە خوای گەورە داوە ﴾. تەواو

٣ أخرجه البخاري : كتاب التوحيد : باب قوله تعالى ﴿ يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا۟ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ ﴾ الفتح: ١٥( ٧٤٩١ ) ومسلم كتاب الألفاظ من الأدب : باب النهي عن سب الدهر (٢٢٤٦) . من حديث أبي هرية رضي الله عنه.

٤ لةبةرطرنطى فةرمودةكة ئيمخوشة هةموو فةرموودةكة بهيَنم هةروةكو لة صحيحى ئيشةوا بوخاريدا بةم شيَوةية هاتووة : ﴿حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ اللَّهُ تَعَالَى يُؤْذِينِي ابْنُ آدَمَ يَسُبُّ الدَّهْرَ وَأَنَا الدَّهْرُ بِيَدِي الْأَمْرُ أُقَلِّبُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ﴾.[ وةرطيرِ ].

● لقی دووەم : ناوەكانی خوای گەورە كورت نەكراوەتەوە لە ژمارەیەكی دیاری كراودا﴿واتە بە ووردی ژمارەی ناوەكانی خوای گەورە نازانرێت–وەرگێڕ﴾ : لەبەر فەرموودە بەناوبانگەكەی پێغەمبەر صلی الله علیه وعلی آله وسلم كەدەفەرموێت ﴿أَسْأَلُكَ بِكُلِّ اسْمٍ هُوَ لَكَ ، سَمَّيْتَ بِهِ نَفسَكَ ، أَوْ أَنْزَلْتَهُ فِي كِتَابِكَ ، أَوْ عَلَّمْتَهُ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ ، أَوِ اسْتَأْثَرْتَ بِهِ فِي عِلْمِ الْغَيْبِ عِنْدَكَ ﴾[1]

واتە ﴿ داوات لێدەكەم بە هەموو ناوێك كەتۆ خاوەنیتی و خۆتت پێ ناوناوە، یان لە كتێبەكەتدا ناردووتەتە خوارەوە، یان فێری یەكێك لە دروست كراوەكانت كردووە، یان لە زانستی غەیبدا لای خۆت هەڵتگرتووە و تەنها خۆت دەیزانیت ﴾[2]

وە كۆبەندی ﴿ جمع وتوفیق ﴾ لەنێوان ئەو فەرموودەیەو فەرموودە صەحیحەكەی تر كە پێغەمبەر صلی الله علیه وعلی آله وسلم دەفەرموێت ﴿إِنَّ لِلَّهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ اسْمًا مِائَةً إِلَّا

---

١ حديث صحيح : جزء من حديث إبن مسعود رضي الله عنه، الذي رواه أحمد ( ١/ ٣٩٤, ٤٥٢ ) وإبن حبان ( ٢٣٧٢–موارد ) والحاكم ( ٥١٩/١ )، وصححه الحافظ إبن القيم في شفاء العليل ( ص٢٧٤ )، واستفاض في بيان أهميته وفوائده في كتابه الفوائد (ص ٢٤ : ٢٩ )، وصححه الشيخ أحمد شاكر في تعليقه على المسند ( ٣٧٢١ ) وكذا الألباني في الصحيحة (١٩٩)، وشعيب الأرناؤوط في تخريج زاد المعاد ( ٤/ ١٩٨ ).

٢ لەبەرگرنگی داواو پاڕانەوەكەی پێغەمبەر صلی الله علیه وعلی آله وسلم بۆ لادانی خەفەت و دڵتەنگی فەرموودەكە وەك خۆی دەهێنین تا بتوانین لەبەری بكەین و كاری پێ بكەین إنشاءالله وە فەرموودەكەش صەحیحە بۆ دڵنیاییت : قَالَ أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ : حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ ، عَنْ فُضَيْلِ بْنِ مرزوق ، حَدَّثَنَا أَبُو سَلَمَةَ الْجُهَنِيُّ ، عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ، عَنْ أَبِيهِ ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى الله عَلَيه وسَلَّم : مَا قَالَ عَبْدٌ قَطُّ إِذَا أَصَابَهُ هَمٌّ ، أَوْ حُزْنٌ : اللَّهُمَّ إِنِّي عَبْدُكَ بْنُ عَبْدِكَ بْنُ أَمَتِكَ ، نَاصِيَتِي بِيَدِكَ ، مَاضٍ فِيَّ حُكْمُكَ ، عَدْلٌ فِيَّ قَضَاؤُكَ، أَسْأَلُكَ بِكُلِّ اسْمٍ هُوَ لَكَ ، سَمَّيْتَ بِهِ نَفْسَكَ ، أَوْ أَنْزَلْتَهُ فِي كِتَابِكَ ، أَوْ عَلَّمْتَهُ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ ، أَوِ اسْتَأْثَرْتَ بِهِ فِي عِلْمِ الْغَيْبِ عِنْدَكَ ، أَنْ تَجْعَلَ الْقُرْآنَ رَبِيعَ قَلْبِي ، وَنُورَ صَدْرِي ، وَجِلاَءَ حُزْنِي ، وَذَهَابَ هَمِّي ، إِلاَّ أَذْهَبَ اللَّهُ هَمَّهُ وَأَبْدَلَهُ مَكَانَ حُزْنِهِ فَرَحًا ، قَالُوا : يَا رَسُولَ اللهِ ، يَنْبَغِي لَنَا أَنْ نَتَعَلَّمَ هَؤُلاَءِ الْكَلِمَاتِ ، قَالَ : أَجَلْ ، يَنْبَغِي لِمَنْ سَمِعَهُنَّ أَنْ يَتَعَلَّمَهُنَّ.﴿ وەرگێڕ ﴾

وَاحِدًا مَنْ أَحْصَاهَا دَخَلَ الْجَنَّةَ ﴾[1] واتە ﴿ خوای گەورە نەدو نۆ ناوی هەیە صەد جگـە لـەیەك هەركەسێك بیانبژێرێت دەچێتە بەهەشتەوە ﴾[2] ئەوەیە كە واتـای ئـەو فەرمودەیـە ئەوە دەگەیەنێت : لـە ناوەكـانی خـوای گـەورە نـەوەدو نـۆ نـاوی هەیـە هەركەسـێك بیانبژێرێت دەچێتە بەهەشتەوە، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت كە ژمارەی ناوەكانی خوای گـەورە كورت كراوەتەوە لـەو ژمارەدا، وێنەی ئەوەش كەبلێی : صـەد درهـەمم هەیـە ئامـادەم كردووە بۆ خێر، جائەوە واتای ئەوە نیە كە درهەمی ترت نەبێت ئامادەت نەكردبێت بـۆ جگە لـەخێر.

● لقی سێهەم : ناوەكانی خوای گەورە بەعەقڵ جێگیر ناكرێـت بـەڵكو بـە شـەرع جێگیر دەكرێت و دەسەلمێنرێت:

لـەبەرئەوەی ناوەكانی خوای گەورە ﴿ توقيفية – وەستێنراوە ﴾ سەلماندی وەستێنراوە لـەسەرئەوەی لـەشەرعدا هاتووە نەلێی زیاد دەكرێت و نەلێی كەم دەكرێت، لـەبەرئەوەی عەقڵ ناتوانێت هەست بەوە بكات كە شایەنی خوای گەورەیە لـە ناوەكـان جالـەبەرئـەوە پێویستە وەستان لـەوەدا لـەسەر ئەوەی لـە شەرعدا هاتووە، وەلـەبەرئەوەی ناونانی بەوەی ناوی لـەخۆی پێ نەناوە یان ملنەدان بەوەی خۆی پێ ناوناوە و پێی نارازی بێت تاوانێكە بەرامبەر خوای پەروەردگار ئەنجام دەدرێت، جابۆیە پێویستە ڕێڕەوی ئەدەب بگیرێتە بـەر لـەو باسەدا.

● لقی چوارەم : هەموو ناوێك لـەناوەكانی خوای گەورە بەڵگەیە لـەسەر زاتی خواو و لـەسەر ئەو سیفەتەی گرتویەتیەخۆی و لـەسەر ئـەو شـوێنەوارەی بەهۆیـەوە دێتـە دی ئەگەر ئەو ناوە (( متعدي)) بێت.

---

١ أخرجـه البخـاري : كتـاب الـدعوات : بـاب لله مائـة اسـم إلا واحـد ( ٦٤١٠ ) ومـسلم : كتـاب الـذكر والـدعاء : بـاب فـي أسـماء الله تعـالى وفـضل مـن أحـصاها ( ٢٦٧٧ ). مـن حديث أبي هريرة رضي الله عنه.

٢ خۆشەویستان بێژەی ﴿أَحْصَاهَا ﴾ بەواتایی ﴿ لـەبەرمان دەكردو كارمان دەكرد﴾.﴿ وەرگێر ﴾.

وە باوەڕیش بەناو نایەتەجیٚ تەنها بەجێگیر کردنی هەموو ئەوانە نەبێت .

نمونەی ئەوە لە ناوێکدا کە (( متعدي )) نەبێت : ناوی ﴿ العظيم ﴾ باوەڕبوون پێی نایەتەدی تا باوەڕت بەوەنەبێت ناوێکە لەناوەکانی خوای گەورە و بەڵگەیە لەسەر زاتی بەرزو گەورەی وە لەسەر ئەو سیفەتەی کەگرتویەتیەخۆی کەئەویش سیفەتی ﴿العظمة – گەورەیەتیە﴾.

وە نمونەی ئەوەش لە ناوێکدا کە (( متعدي )) بێت : ناوی ﴿ الرحمن ﴾ باوەڕبوون پێی نایەتەدی تا باوەڕت بەوەنەبێت ناوێکە لەناوەکانی خوای گەورە و بەڵگەیە لەسەر زاتی بەرزو گەورەی وە لەسەر ئەو سیفەتەی کەگرتویەتیەخۆی کەئەویش سیفەتی ﴿الرحمة – بەزەییە﴾ وەلەسەر ئەو شوێنەوارەی بەهۆیەوە دێتە دی کەئەویش ئەوەیە ﴿بەزەیی بەهەرکەسێکدا دێتەوە کە بیەوێت ﴾.﴿ پوختەی ئەم لقی چوارەمە ئەوەیە کە دەبێت باوەڕت بە هەموو ناوەکان و سیفەتەکانی خوای گەورە و ئەو شوێنەوارانەی بەهۆی ئەو ناوە وە دێتە کایەوە هەبێت و تەسلیمی ببیت و پێی ڕازی بیت – وەرگێڕ﴾

**بنەمای سێهەم::**

لەبارەی سیفەتەکانی خوای گەورەوەیە، وەلەژێر ئەم بنەمایەدا بە هەمان شێوە چەند لقێك هەیە:

● لقی یەکەم : ئاوەڵناوەکانی خوای گەورە هەمووی بەرزن و سیفەتی تەواوو ستایشکراون لەهیچ ڕوویەك لەڕووەکانەوە کەم و کورتی تێدا نیە.

وەکو ﴿ ژیان و زانیاری و توانایی و بیستن و بینین و دانایی و بەزەیی و بەرزییەتی ﴾ جگە لەوەش هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَلِلَّهِ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰۚ ﴾النحل: ٦٠ واتە ﴿هەموو نمونەیەکی بەرزو پڕ شکۆ هەربۆخوای گەورەیە ﴾

وەلەبەرئەوەی پەروەردگار تەواوە بۆیە دەبێت سیفەتەکانیشی هەمووی تەواوبن.

جائەگەر سیفەتێك کەم و کورتی بوو لەهەموو لایەنێکەوە تەواو نەبوو ئەوا ناگونجێت ببێتە سیفەتی خوای گەورەو دوورە لەوە وە وەکو ﴿ مردن و نەزانین و بێ توانایی و کەڕی و کوێری ﴾ و نمونەی ئەوە، لەبەرئەوەی پەروەردگار سزای ئەوکەسانەی داوە کە خوای گەورەیان بە سیفەتێك وەسف کردووە کە کەم و کورتی تێدا بێت و خۆی بەدوور گرتووە لەهەموو ئەو سیفەتانەی ئەویان پێ وەسف کردووە لەکاتێکدا ئەو وەسفکردنە کەم و کورتی تێدا بێت، وەلەبەرئەوەی پەروەردگار نابێت و ناگونجێت کەمو کورتی بێت بۆ نەهێشتنی کەم و کورتی لەپەروەردگاریەتیدا.

وەئەگەر سیفەتەکە تەواو بوو لەڕوویەکەو بەڵام کەم و کورت بوو لە ڕوویەکی ترەوە ئەوا نابێتە سیفەتێکی هەمیشەیی و جێگیر بۆخوای گەورەو بەرەهایش نابێت بەدوور بگیرێت لە خوای گەورە بەڵکو لەم حاڵەتەدا پێویستی بەلەسەر ڕۆیشتن و زیادە باسکردن هەیە، جالەو کاتەدا جێگیرو دەسەلمێنرێت بۆ خوای گەورە ئەگەر سفەتەتەکە واتای تەواویەتی دەگەیاند وە بەدوور دەگیرێت لە خوای گەورە ئەگەر واتای کەم و کورتی و ناتەواوی دەگەیاند وەکو ﴿ مکر، کید، خداع – فێڵکردن ﴾ هاووێنەی ئەوەش، جائەم سیفەتانە وەکو سیفەتێکی تەواو سەیر دەکرێت ئەگەر لەبەرامبەر هاوشێوەی خۆیدا بێت[١] لەبەرئەوەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بکەرەکەی بێ توانا نیە لەبەرامبەر دوژمنەکەیدا کەهەمان کاری کردووە، وەهەر ئەو سیفەتە دەبێتە سیفەتێکی

---

[١] واتە ئەگەر کەسێ بیەوێ بەگومانی خۆی فێڵ لەخوای گەورە بکات ئەوا خوای گەورە لەخۆی باشتر فێڵی لێدەکات و فێڵەکەی ئەویش هەڵدەوەشێنێتەوە ئالەم کاتەدا سیفەتی فێڵکردن کەلەبنچینەدا سیفەتێکی ناشیرین و ناتەواوە دەبێتە سیفەتێکی تەواو بۆخوای گەورە، خوێنەری بەڕێز دەبێت لەکاتی وردبوونەوە لەسیفەتەکانی خوای بەتوانادا زۆر بەوریایی و ژیرانەوە مامەڵە بکەین و نەکەوینە هەڵەوە خوای گەورە یارمەتیمان بدات بەوشێوەیەی کەخۆی پێی خۆشە لە ناو و سیفەتەکانی خۆی تێبگەین – ئامین ﴿ وەرگێڕ ﴾.

کەم و کورت و ناتەواو ئەگەر لەحاڵەتێکدا بەکاربهێرێت جگە لە حاڵەتی یەکەم[1] جاکەواتە ئەم جۆرە سیفەتانە بەکاردەهێنرێت بەخوای گەورە ئەگەر حاڵەتەکە وەکو یەکەم وابوو، بەڵام بەکارهێنانی ئەو جۆرە سیفەتانە بەدوور دەگیرێت لەخوای گەورە ئەگەر بارودۆخەکە وەك حاڵەتی دووەم وابوو.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ﴾ الأنفال: ٣٠

واتە ﴿بەڵێ ئەو کافرانە خەریکی پیلان گێڕان و فێڵکردن بەگومانی خۆیان وە خوای گەورە لەوان بەتواناترە پیلان دابڕێژێت و فێڵیان لێبکات وە هەرخوای گەورە باشترینی پیلان داڕێژەران و فێڵکارانە﴾[2]

---

[1] ﴿ وەك ئەوەی کەسێ هەبێت بێ تاوان و ڕەوشت جوان و ڕێکو پێك هیچ جۆرە لاری و کاری نارەوا ئەنجام نەدات بەڵام کەسێ بلێ خوا باش فێڵی لێدەکات ئالەم کاتەدا بەکارهێنانی سیفەتی فێڵکردن بۆ خوای گەورە دەبێتە سیفەتێکی ناشیرین چونکە نادادپەروەری تێدایە، بەڵام کەسانی بێ باوەڕو دووڕوو هەمیشە واگومان دەبەن بە فڕوفێڵ خوا هەڵدەخەڵەتێنن کەچی جارلەدوای جا شکست دەهێنن و دەدۆڕێن ئەگەر ئالەم کاتەدا بوترێت خوای گەورە باشی فێڵی لێکردن و شکاندنی ئەوا بەکارهێنانی سیفەتی فێڵکردن بۆ خوای گەورە سیفەتێکی تەواو و جوانە چونکە لە تەواوی دادپەروەری خوای گەورەیە فڕوفێڵی ئەوانە لە ناو بەرێت بۆیە دەبێت ئاوا لە سیفەتەکانی خوای گەورە تێبگەین تاگومڕا نەبین﴾. ﴿ وەرگێڕ ﴾.

[2] پێویستە تەماشای ئایەتەکە هەمووی بکەین چونکە پڕاوپڕ بەسەر ئەو ڕونکردنەوەی ڕابووردا دەچەسپێت لەبەرئەوەی خوای گەورە باسی فرو فێڵی کافرانی کردووە دوای ئەوە خوای گەورەش دەفەرمووێت خوا زۆر لەوان بەتواناترە لەوەی فێڵیان لێبکات و فروفێڵی ئەوانیش هەڵبوەشێنێتەوە هەروەکو دەفەرمووێت :﴿ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ ﴿٣٠﴾ ﴾ الأنفال: ٣٠واتە ﴿ بیربکەرەوە کە چۆن بتپەرستەکان پیلانیان داڕێژا کە حەپست بکەن یان بتکوژن یان لە شاری مەککە دەرتبکەن، بەڵێ ئەو کافرانە خەریکی پیلان گێڕان و فێڵکردن بەگومانی خۆیان وە خوای گەورە لەوان بەتواناترە پیلان دابڕێژێتو فێڵیان لێبکات وە هەرخوای گەورە باشترینی پیلان داڕێژەران و فێڵکارانە﴾

وەهەروەها دەفەرمویّت: ﴿إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا ﴿١٥﴾ وَأَكِيدُ كَيْدًا ﴿١٦﴾﴾ الطارق: ١٥ - ١٦

واتە ﴿ ئەو بیّ باوەڕانە هەمیشە لەهەوڵدان بۆ فیّلّکردن تا بەهۆیەوە ئاینەکەی خوای گـــەورە لـــەناو بـــەرن ﴿١٥﴾ وەمنـــیش لەبەرامبەریانـــدا فیّلّدەکـــەم و پیلانـــەکانیان هەلّدەوەشیّنمەوە و فیّلّەکانیان لەناو دەبەم ﴿١٦﴾ ﴾.

وەهەروەها دەفەرمویّت: ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَهُوَ خَادِعُهُمْ﴾ النساء: ١٤٢

واتە ﴿ بیّ گومان دووڕووەکان بە خەیاڵی خۆیان دەیانـەویّت فیّـلّ لـەخوا بکـەن و بیخەلّەتیّنن بەلّام خوای گەورە فیّلّکارو هەلّخەلّەتیّنـەری ئەوانـە هـەموو فڕوفیّلّکانیـان هەلّدەوەشیّنیّتەوە و لەناوی دەبات ﴾[1] وەجگە لەچەندان بەلّگەی تریش .

[1] هەرسیّ ئایەتەکە ئەو ڕاستیە دەسەلمیّنن کە مادام دوژمنانی ئاین فیّـلّ دەکـەن دژ بـەخوا و ئاینەکـەی ئـەوا خواش دژ بەوان فیّلّ دەکات و پیلانەکانی ئەوان لەناو دەبات، بـەکارهیّنانی سـیفەتی فیّـلّ بـۆ خـوا لیّـرەدا سیفەتیّکی تەواو و جوانە چونکە لەبەرامبەر دوژمنەکانیایـەتی و نـاهیّلّیّ فیّلّـەکانیان سـەربگریّتو شـانازی پیّوەبکەن، بابەنمونەیەك بۆت بسەلمیّنم – وردبەرەوە لەچـواردەوری خـۆت و ئـەو ولّاتانـە بەنمونـە وەربگـرە بەئاشکرا و نهیّنی دژایەتی خوا و ئاینەکەی دەکەن بزانە چۆن لەناویان دەبات بازۆر بـەهیّزیش بـن بـۆ ویّنـە ڕوسیا دووەم زلهیّزی جیهان بوو کاتیّك ڕایگەیاند دژایەتی خوای گـەورە دەکـاتو ڕیّگـە لەبلّاوبوونـەوەی ئاینەکەی دەگریّت خوای گەورە بەجۆریّ لاوازی کردن کردنی بەچەندین دەولّەتۆکەو ژیّرخـانی ئابوریـانی داتەپاندو دژمنە سەرسەختەکەی کە ئەمریکایە زالّی کرد بەسەریدا و لەوەش زیاتر بەلّکو هەرچەند کەسـیّك خود بەخود ڕادەپەڕین و بەشیّکیان لیّ دادەبڕی و سەربەخۆیی خۆیانیان ڕادەگەیاند .

وەهەروەها هەریەکە لە سەرۆکەکانی تونس و میصر بەنمونە وەربگرە بزانە چۆن خوای گەورە لەناوی بـردن دوای ئەوەی بەشەو بەڕۆژ خەریکی فیّلّکردن بووون بۆ لەناوبردنی ئەم ئاینە پاکە بەلّام نەیان زانی خـوا زۆر لەوان بەتواناترە لەفیّلّکردندا هەبەخۆیان خۆیانی لەناو بردوو خاوەنی دوو حیزبی گەورەش بـوون لـەدوای لەناوچوونی خاوەنەکانیان حیزبەکانیشیان لەناوچوو .

بۆیە بائاگادار بین ئەوە نەیەت بەخەیالّماندا فیّلّ لەخوا بکەین و وابزانین دەتوانین لەدەستی قوتارمان دەبیّت و دووسیّ ڕۆژیّ دەژین و پاشان دەمرین و ئـیتر زینـدوو نابینـەوە، نـەخیّر وەلّلّـاهی وانیـە ئـەو کەسـەی لـە فیّلّکرندا زەرەر دەکات تەنها ئیّمەین و ڕەنجەڕۆی دونیای دوا ڕۆژ دەبین بۆیە دەبیّت داوا لـەخوای گـەورە بکەین ڕیّنموێمان بکات تا لەسەر ئاینەکەی بمیّنینەوە و بەوشیّوەیەش دینداری بکەین کەخۆی پیّی خۆشەو لیّی ڕازییە وە بەدوورمان بگریّت لەو بیروبۆچونانەی دژایـەتی خـۆیی و ئاینەکـەی دەکـەن وە لـەو کەسانەشـی بانگەشەی بۆ دەکەن – ئامین ﴿ وەرگیّر ﴾.

جا ئەگەر وترا : ئایە خوای گەورە وەسف دەکرێت بە سیفەتی فێڵ بۆنمونە؟

ئەوا لەوەڵامدا مەڵێ بەڵێ، وە مەشڵێ نەخێر، بەڵام بڵێ : ئەو فێڵکارە لەبەرامبەر کەسێکدا کە شایستەی ئەوە بێت . والله أعلم.

● لقی دووەم : سیفەت و ناوەڵناوەکانی خوای گەورە دابەش دەبن بۆ دوو بەش کەئەوانیش :

﴿ ثبوتية : ئەرێیەتی – جێگیرکردن، سلبية : نەرێیەتی – بەدوورگرتن ﴾

١- ثبوتية : ئەرێیەتی – جێگیرکردن: بریتیە لەوەی کەخوای گەورە بۆخۆی بڕیاری داوە و جێگیری کردووە وەکو ﴿ ژیان و زانین و توانایی ﴾ . وەپێویستیشە لەسەر ئێمە جێگیری بکەین بۆخوا بەو شێوەیەی شایستەی خۆیەتی لەبەرئەوەی خوای پەروەردگار خۆی بڕیاری داوە و جێگیری کردووە وە چەسپاندویەتی وە هەر خۆیشی زاناترە بەسفەت و ناوەڵناوەکانی .

٢- سلبية : نەرێیەتی – بەدوورگرتن:بریتیە لەوەی کەخوای گەورە خۆیی لێ بەدوورطرتووە وەکو ﴿ ستەمکردت ﴾ جابۆیە پێویستە ئێمەش ئەو سیفەتە بەدوور بگرین لەخوای گەورە لەبەرئەوەی خوای گەورە خۆی بەدووری گرتووە لە نەفسی خۆی، بەڵام پێویستە باوەڕبوون بە پێچەوانەکەی بۆ خوا لەسەر تەواوترین شێوە چونکە شتی نەفیکراو نابێتە تەواو تا جێگیرکردن لەخۆنەگرێت کەئەویش ﴿ثبوت ﴾ە.

نمونەی ئەوە خوای گەورە دەفەرموێت :﴿وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا ﴿٤٩﴾﴾ الكهف: ٤٩

واتە ﴿ پەروەردگاری تۆ ستەم لەهیچ کەسێك ناکات ﴾ بۆیە پێویستە ستەمکردن لەخوای گەورە بەدووربگرین لەگەڵ باوەڕبوون بە چەسپاندنی ﴿ العدل – دادپەروەری﴾ بەتەواوترین و جوانترین شێوە.

● لقی سێهەم : ئاوەڵناوە ﴿ثبوت﴾یەکان – چەسپاوەکان – جێگیرکراوەکان دابەش دەبن بۆ دوو بەش کەئەوانیش : ﴿ ذاتية : خودی، فعلية : کرداری ﴾:

جائەوەی ﴿ذاتية : خودی ﴾ بریتیە لەوەی کە هەروابووە و هەر واش دەمێنێتەوەو بەوە وەسفکراوە وەکو ﴿السمع والبصر– بیستن و بینین﴾.

وە ﴿فعلية : کرداری ﴾ەکە بریتیە لەوەی وابەستە بە ویستی خۆیەوە، ئەگەر ویستی لێ بێت دەیکات وەئەگەر ویستی لێ نەبێت نایکات وەکو ﴿ بەرزبوونەوە بۆسەر عەرش و هاتن (( المجيء ))﴾.

وەلەوانەیە سیفەتەکە لەهەمان کاتدا هەردوو جۆرەکە بێت ﴿ ذاتية : خودی، فعلية : کرداری ﴾ وەکو ﴿ الكلام – قسەکردن ﴾ لەبەرئەوەی ئەم سیفەتە لە بنچینەدا ﴿ذاتية : خودی ﴾ە چونکە خوای گەورە بەهەمیشەیی قسەی کردووە و هەرواش دەمێنێتەوە قسەدەکات، بەڵام لەڕوانگەی تاکە تاکەی قسەکردنەوە ئەوا سیفەتێکی ﴿فعلية : کرداری ﴾ە لەبەرئەوەی قسەکردن وابەستە بە ویستی خوای گەورەوە هەرکاتێك بیەوێت قسەدەکات و هەرچیشی بوێت دەیلێت.

● لقی چوارەم : هەموو سیفەتێك لەسیفەتەکانی خوای گەورە سێ پرسیاری ڕووبەڕوو دەکرێتەوە کەئەوانیش:

پرسیاری یەکەم : ئایە ئەو سیفەتە سیفەتێکی ڕاستەقینەیە وە بۆچی؟

پرسیاری دووەم : ئایە دروستە چۆنیەتی بۆ باس بکرێت وە بۆچی؟

پرسیاری سێهەم : ئایە هاوشێوەی سیفەتی دروست کراوەکانە وەبۆچی؟

جاوەڵامی پرسیاری یەکەم : بەڵێ سیفەتێکی ڕاستەقینەیە لەبەرئەوەی قسە ((کەلام)) لەبناغەو بنچینەدا ڕاستیەتیە بۆیە لەواتا ڕاستیەکەی خۆی نابێت لابدرێت تەنها بە بەڵگەیەکی ڕاست و دروست نەبێت کەڕێگری لێ بکات.

وە وەڵامی پرسیاری دووەم : نەخێر بەهیچ جۆرێك دروست نیە چۆنیەتی بۆدانانی لەبەرفەرمودەی خوای گەورەدا کەدەفەرموێت : ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا ﴿١١٠﴾﴾ طە: ١١٠ واتە ﴿ زانینی هیچ کەسێك بازۆر زاناش بێت ناگات بە زانینی خوداو ناتوانێت پەی بەزانینی بیٚ سنوری خودا ببات ﴾.

وەلەبەرئەوەی عەقلٚ و ژیری ناتوانێت پەی بە چۆنیەتی سیفەت و ئاوەڵناوەکانی خوای گەورە بەرێت.

وە ڵامی پرسیاری سێهەم : هاوشێوەی سیفەتی دروستکراوەکان نیە بەهیچ جۆرێك لەبەرفەرمودەی خوای گەورەدا کەدەفەرموێت : ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾ الشورى: ١١واتە ﴿ هیچ شتێك هاوشێوە و هاووێنەی خوای گەورە نیە، وەهەر ئەویشە بیسەرو بینایە ﴾.

وەلەبەرئەوەی خوای گەورە شیاوی هەموو تەواویەتیەکە کەهیچ شتێك لەسەروی ئەوە وە نیە جابۆیە ناگونجێت هاوشێوەی دروستکراو بێت چونکە دروستکراو ناتەواوە .

وە جیاوازی لەنێوان ﴿ هاوشێوە و چۆنیەتیدا ﴾ ئەوەیە کە :

﴿ التمپیل-هاوشێوە : باسکردنی چۆنیەتی سیفەتێك کە بەستراوە بەهاوشێوەیەکی وەك خۆی﴾

وە ﴿ التکییف - چۆنیەتی : باسکردنی چۆنیەتی سیفەتێکی سنوردارنەکراوە بەهاوشێوەیەکی وەك خۆی ﴾

نمونەی ﴿ التمپیل-هاوشێوە ﴾ : وەك ئەوەی کەسێك بلێ دەستی خوای گەورە وەکو دەستی مرۆڤ وایە.

وەنمونەی ﴿ التکییف - چۆنیەتی ﴾ : ئەوەیە کە خەیاڵ و بیرکردنەوە بکات بۆ دەستی خوای گەورە و چۆنیەتیەکی بۆ دابنێت کەهاوشێوەی نەبێت لە دەستەکانی دروستکراوەکاندا جا ئەو جۆرە خەیاڵ و بیرکردنەوەیە بەهیچ جۆرێك دروست نیە.

## بنەمای چوارەم:

لەوەی کە ڕەدی ﴿ المعطلة ﴾ی پێ دەدەینەوە :

﴿المعطلة﴾ بریتین لەوانەی کە ملنادەن بۆ بەشێك لە ناوەکانی خوای گەورە یان سیفەت و ئاوەڵناوەکانی وە دەقەکان لە ڕووکەشی خۆی لادەدەن و دەیگۆڕن وە پێشیان دەگوترێت ﴿المؤولة – ئەوانەی ڕاستیەکان دەگۆڕن و دەیشێوێنن ﴾ وە ئەو بنەما گشتیەیی کە ڕەددی ئەوانی پێ دەدەینەوە ئەوەیە کە دەڵێین قسەکەیان : پێچەوانەی ڕووکەشی دەقەکان و پێچەوانەی ڕێگەو ڕێبازی پێشینە و هیچ بەڵگەیەکی ڕاست و دروستی لەسەر نیەو لەوانەشە لەهەندێ سیفەت و ئاوەڵناودا لایەنی چوارەم یان زیاتریش هەبێت. ﴿ مەبەستی شێخ ڕەحمەتی خوای گەورەی لێ بێت ئەوەیە چونکە ئەوان لە خۆیانەوە قسەدەکەن و بەڵگەیان بەدەستەوە نیە هەر لەخۆیانەوە ناوو ئاوەڵناوەکانی خوای گەورە دەگۆڕن و ڕاڤەی بۆدەکەن بۆیە دەکەونە هەڵەی گەورەوەو چەندین لایەنی بۆ دادەنێن تەنها لەبەرئەوەی لەگەڵ هەواو ئارەزووە پوچەکانیاندا بیگونجێنن– وەرگێڕ﴾.

## پێشەکی خاوەنی دەقی ﴿لمعة الإعتقاد﴾
## پێشەوا ئیبن و قودامەی مەقدیسی

شێخی پایەرزو پێشەواو زانـای بـەڕێز ﴿ موفـق الـدين عبـدالله بـن أحمـد بـن قدامـة المقدسي﴾ ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت:

بسم الله الرحمن الرحيم

الحَمْدُ للهِ المحمُودِ بِكُلِّ لِسانٍ، المعبودِ في كُلِّ زَمانٍ، الَّذِي لا يَخْلُو مِنْ عِلْمِهِ مَكان، ولا يشغَلُه شانٌ عن شانٍ، جلَّ عَنِ الأشـباهِ والأنْـدادِ، وتَنَـزَّهَ عَـنِ الـصَّاحِبَةِ والأولادِ، ونَفِـذَ حُكمُهُ في جميعِ العبادِ، لا تُمَثِّلُهُ العقولُ بالتفكيرِ، ولا تَتَوَهَّمُهُ القلوبُ بالتصوير،

﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾ ﴾ الشورى: ١١، لَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى والصفاتُ العُلى، ﴿ ٱلرَّحْمَٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ ﴿٥﴾ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَمَا تَحْتَ ٱلثَّرَىٰ ﴿٦﴾ وَإِن تَجْهَرْ بِٱلْقَوْلِ فَإِنَّهُۥ يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ وَأَخْفَى ﴿٧﴾ ﴾ طـه: ٥ ـ ٧ ، أَحاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا ، وقَهَرَ كلَّ مخلوقٍ عِزَّةً وحُكْمًا، ووسِعَ كـلَّ شـيءٍ رحمـةً وعِلمًـا، ﴿ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا ﴿١١٠﴾ ﴾ طـه: ١١٠، مَوْصـوفٌ بمـا وصفَ به نفسَهُ في كتابِهِ العظيمِ، وعلى لسانِ نَبِيِّهِ الكريمِ.

سوپاس بـۆ ئـەو خودایـەی کەبەهـەموو زوبانێـك سـوپاس دەکرێـت، دەپەرسـترێت لەهەموو کاتێکدا، هیچ شوێنێك نیە لە زانیاری ئەو بەتاڵ بێـت، هـیچ شـتێك ناتوانێـت خوای گەوری سەرقاڵ بکات بۆئەوەی نەتوانێت شتێکی تر ئەنجام بدات، خـوای گـەورە زۆر لەوە بەرزترە کەهاوشێوە و هاوبەشـی هـەبێت، وەزۆر دوورە لـەوەی کەپێویـستی بەهاوڕێ و منداڵ هەبێت، وەهەموو حوکم و بڕیارەکانی بەسەر هەموو بەندەکانیدا جـێ بەجێ بووە، هیچ کاتێك عەقڵەکان ناتوانن لەئەنجامی بیرکردنەوەیانـدا وێنـەو شـێوەیەك بۆخوا دابنێن و بڵێن خوا ئاواو ئاوایە، وەهیچ کاتێکیش دڵەکان ناتوانن وا گومان بەرن

شێوەی خـوای گـەورە بـەو شـێوەیەیە کـە ئـەوان بـیری لێدەکەنـەوە، خـوای گـەورە دەفەرموێت :﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾ ﴾ الشورى: ١١

واتە ﴿ هیچ شتێك هاوشێوە و هاووێنەی خوای گەورە نیە، وەهەر ئەویـشە بیـسەرو بینایە ﴾.

هەموو ناوێکی جـوان و سـیفەتێکی بـەرز بۆئـەو و شایـستەی ئـەوە خـوای گـەورە دەفـــــەرموێت :﴿ٱلرَّحْمَٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ ﴿٥﴾ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَمَا تَحْتَ ٱلثَّرَىٰ ﴿٦﴾ وَإِن تَجْهَرْ بِٱلْقَوْلِ فَإِنَّهُۥ يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ وَأَخْفَى ﴿٧﴾ ﴾ طـــه: ٥ – ٧

واتە ﴿خوای گەورە بەرزبووەتەوە بۆسەر عەرشەکەی خۆی ﴿٥﴾ هەرچی لەئاسمانەکانو هەرچیش لەزەویدایە هەرشـتێکیش لەنێوانیاندایـەو ئـەوەش لـەناو خاکدایـەو شـاراوەیە هەرهەمووی موڵکی ئەوە ﴿٦﴾ وەئەگەر تۆ بەئاشـکرا قـسەبکەیت و دەنـگ هـەڵبڕیت وەیان بە هێواش و هێمنی قسەبکەیت لای خـوای گـەورە یەکـسانە لەبەرئـەوەی زانـاو شارەزایە بەهەموو نهێنی و شاراوەیەك ﴾.

خـوای پـەروەردگار بـە زانـست و زانیاریەکـەی دەوری هـەموو شـتێکی داوە، وە هەرچی دروستکراوێك هەیە خـوای پـەروەردگار بـە بڕیـارو هێـزو دەسـتەڵاتی خـۆی زاڵبووە بەسەریانداو ژێرباری کردوون بۆ جێ بەجێ کردنی بڕیارەکانی خۆی هـەروەکو دەفەرموێت :﴿ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا ﴿١١٠﴾ ﴾ طه: ١١٠

واتە ﴿ خوای گەورە بەهـەموو ئـەو شـتانە دەزانێـت و شـارەزایە کەئـەوان پێـشیان خستووە و کردویانە لـەدونیادا وەهەروەها بەوشتانەش شارەزایەو دەزانێـت کەلـەڕۆژی دوایدا چاوەڕێیانە، واتە ئاگای لەهەموو شتێکە، زانینی هیچ کەسێك بازۆر زانـاش بێـت ئاگات بە زانینی خوداو ناتوانێت پەی بەزانینی بێ سنوری خودا ببات ﴾.

خوای گەورە وەسف کراوە بـەوەی خـۆی لـە قورئانـدا وەسـفی خـۆی پێکـردووە وەهەروەها لەسەر زاری پێغەمبەرەکەی صلى الله عليه وعلى آله وسلم وەسفکراوە.

## ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

اللمعة: لەزمانەوانیدا بەچەند شێوەیەك بەكاردەهێنرێت لەوانە : البلغة : بریتیە لەوەی پێداویستیەكەی پێ پڕبكرێتەوە هەربۆیەش فەرمویەتی ﴿ البلغة من العیش – گەیشتن بەوەی پێویستیەكانی بژێوی بەهۆیەوە دابین بووە – وەرگێڕ ﴾ وەئەو واتایەش گونجاوترین مانایە بۆ بابەتی ئەم پەرتووكە.

جا واتای لمعة الإعتقاد لێرەدا بریتیە لە گەیشتن بە بیروباوەڕێكی ڕاست و دروست كە ڕیك بێت لەگەڵ ڕێگەو ڕێبازی پێشین ڕەزای خوا لەهەموویان بێت.

وە واتای الإعتقاد بڕیارێكی یەكلاكەرەوەی بیرو هۆشە جا ئەگەر هاوڕێك بوو لەگەڵ ئەو ڕووداوەی بڕیارەكەی لەبارەوە دراوە ئەوە ڕاست و دروستە وە ئەگەر وانە بوو ئەوا ڕاست نیەو هەڵەیە.

**ئەوەی وتاری پەرتووكەكە لەخۆی گرتووە :**

وتاری دانەر لەم پەرتووكەدا ئەم شتانەی لە خۆگرتووە:

١- دەست پێكردن بە ﷽ وەك شوێنكەوتنێك بۆ قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم.

وە ﷽ بە واتای هەڵدەستم بە كردنی ئەو شتە لەگەڵ داوای یارمەتی كردن لە خواو پیرۆزكردنی بەهەموو ناوێك لە ناوەكانی خوای گەورە كە وەسفكراوە بە بەزەییە فراوانەكەی، وە الله بە واتای پەرستراو دێت لەبەر خۆشەویستی و بەگەورەدانانی و كردنی بە پەرستراوو سۆزێك بۆی، وە الرحمن خاوەنی بەزەییەكی فراوانە، وە الرحیم گەیەنەری بەزەییەكەیەتی بەهەركەسێك لە دروستكراوەكانی، جا جیاوازی نێوان ﴿الرحمن و الرحیم﴾ بریتیە لەوەی كە یەكەمیان چونكە سیفەتی بەزەییە وەسفێكە

بۆخوای گەورە بەڵام دووەمیان کردارێکە بۆ خوای گەورە بیەوێت بەهەرکەسێکی بگەیەنێت لە دروستکراوەکانی ئەوا دەیگەیەنێت.

٢- پیاداهەڵدان بەسەرخوای گەورەدا بە سوپاسکردنی وە سوپاسکردنیش باسکردنی هەموو وەسفە سوپاسکراوە تەواوەکانیەتی وە کردەوە جوانەکانی لەگەڵ ئەو پەڕی دەربڕینی خۆشەویستی بۆیی و بەگەورەدانانی.

٣-خوای گەورە سوپاسکراوە بەهەموو زوبانێك و پەرستراوە لەهەموو شوێنێك واتە شیاویەتی و دروستە کە سوپاس بکرێت بەهەموو زوبانێك و بپەرسترێت لە هەموو شوێنێکدا.

٤- فراوانی زانستی خوای گەورە بەوەی هیچ شوێنێك نیە لە زانینی ئەو خاڵی بێت وە تەواوی توانایەتی و دەوردرانی هەموو شتێك بە زانستی خوای گەورە بەجۆرێك هیچ شتێك ناتوانێت سەرقاڵی بکات بەوەی نەتوانێت کارێکی دی ئەنجام بدات.

٥- گەورەیەتی و باڵادەستی و بەرزییەتی خوای گەورە لەهەموو هاوشێوە و هاوەڵێك و وێکچویەك لەبەر تەواویەتی سیفەتەکانی لە هەموو ڕوویەکەوە .

٦- بە پاکڕاگرتن و پیرۆزدانانی و بەدوورگرتنی لەهەموو ژن و منداڵ و هاوەڵێك ئەوەش لەبەر تەواویەتی دەوڵەمەنی کەپێویستی بەوانە نیە.

٧- تەواویەتی ویست و دەستەڵاتی بەجێ بەجێ کردنی بڕیارەکانی بەسەر هەموو بەندەکانیدا جابۆیە هیچ هێزو موڵك و ژمارە و سامانێك ناتوانێت ڕێگر بێت لەبەرامبەر بڕیارەکانی خوای گەورەدا لەکاتێکدا کە دەریدەکات.

٨- گەورەیەتی خوای گەورە لەسەروی ئەوە وەیە کەبەخەیاڵ و ئەندێشەی مرۆڤدا بێت بەجۆرێك کە هیچ عەقڵێك ناتوانێت هاوشێوەیەکی بۆدابنێت و هیچ دڵێکیش

ناتوانێت بەخەیاڵی خۆی وێنەیەکی بۆ دیاری بکات، لەبەرئەوەی خوای گـەورە ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ١١﴾ الشورى: ١١

واتە ﴿ هیچ شتێك هاوشێوە و هاووێنەی خوای گەورە نیە، وەهەر ئەویشە بیسەرو بینایە ﴾.

٩- تایبەتی خوای گەورە بە ناوە جوان و سیفەتە بەرزەکانەوە.

١٠- بەرزبوونەوەی خوای گەورە بۆسەرعەرشەکەی خۆی کە بریتیە لە بەرزییەتی و جێگیربوونی بەو شێوەیەی کەشایستەو شیاوی خۆیەتی.

١١- گشتگیریەتی موڵکەکەی بە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەش لە ژێر خۆڵ و خاکدایە.

١٢- فراوانی زانستەکەیی و بەهێزی دەستەڵات و بڕیارەکەی، وەئەوەی کە دروستکراوەکان ناتوانن پەی بە زانیاریەکانی خوای گەورە بەرن لەبەر کەمی هەستکردنیان بەوەی شایستەی پەروەردگاری مەزنە لە سیفەتەکانی تەواویەتی و گەورەیەتی.

## ملکەچ بوون و وەرگرتن
## بۆ ئایەتەکان و فەرموودەکانی سیفەتەکانی خوای گەورە

وكلُّ ما جاءَ في القرآنِ أو صَحَّ عنِ المصطفى عليه السلامُ منْ صفاتِ الرحمنِ وَجَبَ الإيمانُ بِهِ وتَلَقِّيهِ بالتَّسْليمِ والقَبُولِ، وتَرْكِ التَّعَرُّضِ لَهُ بالرَّدِّ والتَّأويلِ، والتَّشْبِيهِ والتَّمْثِيلِ. وما أَشْكَلَ مِنْ ذلك وَجَبَ إثْباتُه لفْظا، وتَرْكُ التَّعَرُّضِ لِمعْناه، ونرُدُّ عِلْمَه إلى قائله، ونجعلُ عُهْدَتَهُ على ناقِلِه، إتِّباعا لطريقِ الرَّاسِخِين في العِلْمِ، الّذين أثْنَى الله عليْهِم في كتابِهِ المُبين بقوله سبحانَهُ وتعالى ﴿وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ﴾ آل عمران: ٧، وقالَ في ذَمِّ مُبْتَغِي التَّأويلِ لمتشابهِ تَنْزِيلِهِ ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۖ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ﴾ آل عمران: ٧ ، فَجَعَلَ ابْتِغاءَ التَّأويلِ علامَةَ الزَّيْغِ وقَرَنَهُ بابْتِغاءِ الفِتْنَةِ في الذَّمِّ، ثم حَجَبَهُمْ عمَّا أَمَّلُوهُ، وقَطَعَ أَطْماعَهُمْ عمَّا قَصَدُوهُ، بقوله تعالى ﴿وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ﴾.

وەهەموو ئەوەی لەقورئاندا هاتووە، یان بەصەحیحی ڕیوایەت کراوە لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وعلى آله وسلم پێویستە باوەڕبوون پێی و پێشوازی کردنی بە ڕازیبوون پێی و وەرگرتنی، وە وازهێنان لەبەگژداچوونەوەی بە وەرنەگرتنی و گۆڕینی و وێکچواندنی و هاوشێوە بۆدانانی، وەهەر چیەکیش لەوەدا کێشەی دروستکرد پێویستە

لەسەرمان لەفزەکەی وەکو خۆی بچەسپێنین و جێگیری بکەین [١] وە وازهێنان لەبەگژداچوونەوە بۆ واتاکەی، وەئێمە زانینی واتاو چۆنیەتیەکەی دەگێڕینەوە بۆلای

---

[١] توێژینەوە:
زانای پایەبەرز ﴿ محمدی کوڕی ئیبراهیمی ئالە شێخ ﴾ ڕەحمەتی خوای لیّ بێت لەکاتی باسکردنی ئەم باسەی ئبن و قدامەدا کەفەرمووی (( وجب الإيمان به لفظا )) دا دەفەرموێت : ﴿ هەرچی دەربارەی ئەم قسەیەی خاوەنی اللمعتیە لەو شتانەیە کە تێبینی کراوە لەم پەرتووکەی بیروباوەڕدا، وەبێگومان چەند قسەیەك لەم پەرتووکەدا هەیە لەسەر دانەرەکەی تێبینی کراوە، چونکە شاراوەنیە کە ڕێگەو ڕێبازی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بریتیە لەباوەڕبوون بەوەی چەسپاوە لە قورئان و سوننەتدا لەبارەی ناو و سیفەتەکانی خوای گەورەوە ئیتر لەڕووی= =لەفزەوە بێت یان لەڕووی واتاوە، وەباوەڕبوونە بەوەی کەئەم ناو و سیفەتانە بەو شێوەیەن و شێوەی ڕاستەقینەیان ئاوایە نەك باوەڕمان وابێت کە ناو و سیفەتەکانی خوای گەورە (( مەجازین – واتە خوازە بن و دوو واتای هەبێت بەواتای ئەوەی لەدەربڕیندا مەبەستی شتێکە کە ڕووکەشەکەیەتی وە لەناوەڕۆکدا مەبەستی شتێکی دیکەیە )) پێویستە ئێمەی ئەهلی سوننە باوەڕمان وابێ کە ناو و سیفەتەکانی خوای گەورە ماناو واتای ڕاستەقینەیان هەیە بەجۆرێك کە شیاو و شایستەی خوای گەورە خۆیەتی، وە بەڵگەی لەوە زۆرترە بوترێت ئەوەندەیەو بەس، وەواتای ئەم ناوانە زۆر ڕوون و ئاشکراو ناسراوە لەقورئاندا هەروەکو شتەکانی تر هیچ نهێنی و نارەحەتی و کێشەیەکی تێدا نیە بێگومان هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم قورئانیان لەوە وە وەرگرتووە وە هەروەها فەرمودەکانیشیان لەوە وە گواستووەتەوە و هیچ کێشەیەکیشیان بۆدروست نەبووە لە واتاو تێگەیشتنی ئەم ئایەت و فەرمودانەدا لەبەرئەوەی زۆر ڕوون و ڕاشکاوە، وەبەهەمان شێوە ئەوانەشی لەدوای ئەوانەوە هاتوون لە سەدە پڕخێرەکان هەروەکو دەگێڕدرێتەوە لە پێشەوا مالیکەوە کەپرسیاری لێدەکرێت دەربارەی ئایەتی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ۝٥﴾ طه: ٥ئەویش لەوەڵامدا دەفەرموێت: ﴿بەرزبوونەوە زانراوە، وە چۆنیەتی بەرزبوونەوەکە نەزانراوە، وە باوەڕهێنان پێی پێویستە، وە پرسیارکردن لەبارەیەوە بیدعەیە﴾، وەبەهەمان شێوە هاوشێوەی ئەوە لە ڕەبیعەی مامۆستای پێشەوا مالیکەوە دەگێڕدرێتەوە، وەهەروەها لە ئوم و سەلەمەشەوە = =بەهەردوو ڕێگەی مەوقوفی و مەرفوعی ((مەوقوفی : خۆی ووتویەتی، مەرفوعی : لەپێغەمبەرەوە صلی الله علیه وعلی آله وسلم دەیگێڕێتەوە)) .
بەڵام ئەوەی خاوەنی اللمعة باسی دەکات جیّ بەجیّ دەبێت بەسەر ڕێچکەی (( المفوضة )) کەئەویش خراپترینی ڕێچکەکان و پیسترینیانە، وە دانەر پێشەوای ئەهلی سوننەیە و وە دوورترین کەسێکیشە لە ڕێچکەی (( المفوضة )) و جگە لەوانیش لەبیدعەچیەکان، والله أعلم . وصلى الله على محمد وآله وصحبه وسلم ﴾ تەواو نووسینگەی الإفتاء لە ١٣٨٥/٧/٢٨ھ وەرگیراوە لە فەتواکان و نامەکانی زانای پایە بەرز محمد بن ئیبراهیم لەکۆکردنەوە و ڕێکخستنی محمدی کوڕی عبدالرحمن ی کوڕی قاسمە.
منیش دەڵێم (( لێکۆڵەر )) هەرکەسێك بگەڕێتەوە بۆ بەرهەمەکانی ئبن و قودامە ڕەحمەتی خوای لیّ بێت بەدڵنیاییەوە بۆی دەردەکەوێت و دەزانێت کە زانای پایەبەرز ئبن و قودامە زۆر دوورە لە ڕێچکەی (( المفوضة )) و ئەهلی تەئویلەوە بەتایبەتی پەرتووکەکەی خۆی (( ذم التأويل )) کەتیایدا ڕەدی ئەهلی تەئویلی داوەتەوە و وەهەرکەسێکیش لەڕێی ئەوانەوە بڕوات لە (( المفوضة )) وە تیایدا ڕێگەو ڕێبازی ئەهلی سوننەی چەسپاندووە لەباوەڕهێنان بەوەی کە چەسپاوە لە لەقورئان و سوننەتدا لەبارەی ناوەکان و سیفەتەکانی خوای گەورەوە ﴿ لفظا – دەربڕین، ومعنى – واتاو مانا ﴾.
جائەوەی لێرەدا هاتووە دەربارەی ئبن و قودامە لەبارەی وتەکەیەوە (( وجب الإيمان به لفظا )) لەو ووتانەیە کورت و لەیەکچووە لەپەرتووکەکانی تریدا زۆر بەڕاشکاوی و ئاشکرای ڕوونکراوەتەوە جابۆیە پێویستە بگێڕدرێتەوە بۆلای قسە موحکەم و پتەوەکانی ڕەحمەتی خوای لیّ بێت، جاکەواتە هەرشتێك هاتبوو لەوە وە کە دوو لایەن و قسەی هەڵدەگرت ئەوە دەگەڕێتەوە بۆلای ئەو لایەنەیان کە موحکەمە لە تەواوی بەرهەم و پەرتووکەکانیدا، خواش زاناترەو باشتر دەزانێت.

خاوەنەکەی و لێی نادوێین، وە بەرپرسیاریەتی ئەو ئەوەی بۆمان گوازراوەتـەوە دەخەینـە سەر شانی ئەوەی بۆی گواستوینەتەوە، وەك شوێنکەوتنێك بۆ ڕێگـەو ڕێبـازی ئەوانـەی ڕۆچوون لـەزانستدا ئەوانـەی خـوای گـەورە لەقورئانەکەیـدا بەباشـی باسـی کـردوون هـــەروەکو دەفـــەرموێت :﴿ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ ﴾ آل عمران: ٧ واتە ﴿ئەو کەسانەی لەزانستدا ڕۆچوو دامەزراوو زۆر زانان دەڵـێن :ئێمـە باوەڕمان بەهەموو ئەو شتانە هەیە کەلەلایەن پەروەردگارمانەوە هـاتووە کـە (( محکـم و متشابە ))﴾.

وەهەروەها لـەبارەی ئەوانەی ئارەزووی ئەوە دەکەن بەشـوێن (( متـشابە ))دا بـڕۆن لـەبارەیانـەوە دەفـەرموێت : ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۗ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ ﴾ آل عمران: ٧ واتە ﴿ جائەوانەی لـەدڵیانـدا لادان و چەوتی هەیە هەمیشە ئامادەن بۆ فیتنە نانەوە بەردەوام بەشـوێن موتەشـابهەکاندا دەگەڕێن و بەئارەزووی خۆیان ڕاڤەیان بۆ دەکـەن بەمەبەسـتی گێـرە شـێوێنی و لادانـی خەڵکی لەڕێگەی ڕاست و دروستکردنی گومان بۆیان لـەکاتێکدا تەفسیرو لێکدانەوەی مانا ڕاستەکەیان خوا نەبێت کەسێکی تر نایزانێت کـەوابوو ئێمـە هـە تەسـلیم بـوون و ملکەچیمان لەسەرە﴾.

جابۆیە بەشوێندا چوونی لێکدانەوەی موتەشابهی بەنیشانەی گومڕابوون دانا وەنزیکی کردەوە لـەو کەسانەی دەیانـەوێت ئـاژاوە و فیتنـە بنێنـەوە لـەناو خەڵکیـدا، پاشـانیش بـەدووری گـرتن لــەوەی بـزانن مانـای ئـەو شـتەی بەشـوێنیدا دەگـەڕێن و هــەموو ئاواتەکانیانی پچڕاندا لـەوەی مەبەستیانە دەسـتیان بکـەوێت بـەوەی کەفـەرموی ﴿ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ ﴾.



ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

**دابەشکردنی دەقەکانی سیفەتەکانی خوای گەورەو ڕێگەی خەڵکی لەتێگەیشتنیدا:**

ئەو دەقانەی لەقورئان و سوننەتدا هاتووە لەبارەی سیفەتەکانی خوای گەورەوە دابەش دەبێت بۆ دووبەش : ڕوون و ئاشکرا، وە نهێنی و شاراوە .

جائەوەی ڕوونە بریتیە لەوەی هەم لەفزەکەی وە هەم واتاکەی ڕوون و ئاشکرایە بۆیە پێویستە باوەڕ بەلەفزەکەی بێنین و بەڕاستیش واتاکەی بچەسپێنین و جێگیری بکەین بەبێ ڕەد کردنەوە و گۆڕینی، وەبەبێ وێکچواندن و هاووێنە بۆدانان لەبەرئەوەی شەرعەکەی خوا هێناویەتی هەرلەبەرئەمە پێویستە باوەڕبوون پێی و ڕازیبوون بە وەرگرتنی و ملکەچ بوونی تەواو بۆی.

وەهەرچی دەربارەی نادیارەکانە بریتیە لەوەی کە واتاکەی ڕوون نیە لەبەرکورتی لەبەڵگەکەیدا یان کەمی لەتێگەیشتنی خوێنەرەکەیدا جابۆیە پێویستە لەفزەکەی بچەسپێنین و دانی پێدا بنێین لەبەرئەوەی لەشەرعدا هاتووە وە وەستان لەواتاکردنیدا وە وازهێنان و دەستهەڵگرتن لە بەگژداچوونەوەی لەبەرئەوەی نادیارە ناکرێ بڕیاری لەبارەوە بدەین هەرلەبەرئەوە زانینی واتاکەی دەگێڕینەوە بۆ لای خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی صلى الله عليه وعلى آله وسلم .

بەدڵنیاییەوە ڕێگەکانی خەڵکی لەبارەی نادیارەکانەوە دابەش بووە بۆ دوو ڕێگە :

**ڕێگەی یەکەم :** ڕێگەی ڕۆچووەکانە لەزانستدا ئەوانەی کەباوەڕیان بەهەریەکە لە موحکەم و موتەشابە هەیەو ووتیان﴿ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا ﴾ وە وازیان هێنا لە بەگژداچوونەوەی ئەو شتەی کەناتوانن پێی بگەن بۆئەوەی شارەزای بن و پەی پێ بەرن

لەبەرئەوەی خواو پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وعلی آله وسلم بەگەورەو بەرز دەگرنو زۆریش بەئەدەبن لەگەڵ دەقە شەرعیەکاندا وەهەر ئەوانن کە خوای گەورە بەباشە باسیان دەکات و لەبارەیانەوە دەفەرموێت : ﴿وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ﴾ آل عمران: ٧ واتە ﴿ئەو کەسانەی لەزانستدا ڕۆچوو دامەزراوو زۆر زانان دەڵێن :ئێمە باوەڕمان بەهەموو ئەو شتانە هەیە کەلەلایەن پەروەردگارمانەوە هاتووە کە (( محکم و متشابە )) ﴾

**ڕێگەی دووەم :**: ڕێگەی بەلاڕێدا چوو گومڕایانن ئەوانەی شوێن موتەشابھ کەوتن لەبەر ئەوەی دەیانەوێت ئاژاوە لەناو خەڵکیدا دروست بکەن و لەمپەر لەڕێگەی ئاینەکەیاندا دانێن و لەڕێگەو ڕێبازی پێشیە چاکەکان لایان دەن جابۆیە هەوڵیان داوە ئەو موتەشابھانە بۆئەو شتەی کەخۆیان دەیانەوێت ماناکەی بگۆڕن نەك بۆئەوەی کەخواو پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وعلی آله وسلم دەیانەوێت، و هاتوون دەقەکانی قورئان و سوننەتیان هەندێکیان بەهەندێکە تریاندا داوە و هەوڵیانداوە تانە لەبەڵگە هێنانەوەکەی بگرن بەدژایەتیکردن و کەمکردنەوەی نرخەکەی تا موسڵمانان بخەنە گومانەوە لەبارەی کردنە بەڵگەی ئەو دەقانە و کوێریان بکەن لەڕێگە ڕوون و ڕێنمایەکەی، ئەوانە ئەو کەسانەن کەخوای گەورە بەخراپ باسیانی کردووە و لەبارەیانەوە فەرمویەتی : ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۗ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ﴾ آل عمران: ٧ واتە ﴿ جائەوانەی لەدڵیاندا لادان و چەوتی هەیە هەمیشە ئامادەن بۆ فیتنە نانەوە بەردەوام بەشوێن موتەشابھەکاندا دەگەڕێنو بەئارەزووی خۆیان ڕاڤەیان بۆ دەکەن بەمەبەستی گێرە شێوێنی و لادانی خەڵکی لەڕێگەی ڕاست و دروستکردنی گومان بۆیان لەکاتێکدا تەفسیرو لێکدانەوەی مانا ڕاستەکەیان خوا نەبێت کەسێکی تر نایزانێت کەوابوو ئێمە هە تەسلیم بوون و ملکەچیمان لەسەرە﴾.

**ساغکردنەوەی قسە لە دەقەکاندا لە ڕووی ڕوونی و ناڕوونیەوە:**

بێگومان ڕوونی و ناڕوونی لەدەقە شەرعیەکاندا کارێکی نیسبی ڕێژەییە خەڵکەی تیایدا جیاوازن بەگوێرەی زانست و تێگەیشتنیان چونکە دەگونجێت ئەوەی لای کەسێك نادیاربێت لای کەسێکی تر ڕوون و ئاشکرا بێت، وەئەوەی پێویستە لەبەرامبەر ئەو شتانەی ڕوون و ئاشکرانیە شوێنکەوتنی ئەوەیە کە ڕابوورد لەوەی باسکرا لە وازهێنان لەبەگژداچوونەوەیی و پەهاویشتن بۆئەوەی واتای بکات بەڵام لە ڕووی ڕاستی دەقە شەرعیەکانەوە سوپاس بۆخوا شتێکی وای تێدا نیە نادیار بێت هیچ کەسێك لەخەڵکی نەبێت واتاکەی نەزانێت دەربارەی ئەو شتەی گرنگە بۆیان لەبارەی دین و دونیایانەوە لەبەرئەوەی خوای گەورە قورئانی بەوە وەسف کردووە کە ڕووناکییەکی دیارو ئاشکرایە وە ڕۆشنکەرەوەیە بۆخەڵکی و جیاکەرەوەیە وە خوای گەورە ئەو قورئانەی دابەزاندووە وەك ڕۆشنکەرەوەیەك بۆ هەموو شتێك وە ڕێنمایی و ڕەحمەت و بەزەییە، وەهەر ئەوەش ئەوە دەخوازێت کە لەدەقەکاندا شتێك نەبێت نادیاربێت بەگوێرەی بارودۆخەکە بەجۆرێك کە هیچ کەسێك لە ئوممەتدا نەبێت واتاو ماناکەی بزانێت.

**واتای ڕەدکردنەوە و بەرپەرچدانەوە و گۆڕین و وێکچواندن و هاوشێوە بۆدانان و حوکمی هەریەکە لەوانە :**

**ڕەدکردنەوە و بەرپەرچدانەوە**: واتە بەدرۆخستنەوە و ملنەدان بۆی نمونە کەکەسێك بڵێت : خوا دەستی نیە نەلەڕاستیدا و نەلە خەیاڵدا کەئەوەیش بێ باوەڕییە لەبەرئەوەی بەدرۆخستنەوەی خواو پێغەمبەرەکەیەتی صلی الله علیه وعلی آله وسلم .

**گۆڕین** ﴿ التأویل ﴾: بریتیە لە ڕاڤەکردن بەڵام لێرەدا مەبەست لێی تەفسیرکردنی دەقەکانی سیفەتەکانی خوای گەورەیە بەبێ ئەوەی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وعلی آله وسلم بیانەوێت وە بەپێچەوانەی ئەوەی کە هاوەڵان و شوێنکەوتوانی ئەوان بەچاکە بەو شێوە تەفسیرو ڕاڤەیان کردبێت.

## حوكمی گۆڕین و ﴿ التأويل ﴾ سێ جۆرە:

یەکەم : ئەگەر بەشێوەیەك بوو کە ئیجتیهادوو تێکۆشان و لەنیەت پاکیەوە بوو بەجۆرێك ئەگەر ڕاستیەکەی بۆ دەرکەوت و ڕوون بویەوە گەڕایەوە لەو ڕاڤەکردنە هەڵەیەی ئەوا هیچی لەسەر نیەو خوای گەورە لێی ناگرێت چونکە ئەوە ئەوپەڕی هەوڵدانیەتی بۆتێگەیشتن لەو باسە وە بێگومانیش خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴾ البقرة: ٢٨٦واته ﴿ خوای گەورە ئەرك ناخاتە سەر شانی هیچ کەسێك بەدەر لە وزەو توانای خۆی ﴾ ﴿ ئەم کەسەش هەوڵیداوە بۆئەوەی بگاتە ڕاستی بابەتەکە بەڵام نەیپێکاوە و کاتێ بۆی ڕوون دەبێتەوە لەسەر هەڵەیە خێرا دەگەڕێتەوە لەهەڵەکەی و دەست هەڵدەگرێت و داوای لێخۆشبوون دەکات لەخوای گەورە بۆیە ئەم جۆرە کەسانە هیچیان لەسەر نیەو خوای گەورە گەڕانەوەکەیان لێوەردەگرێت و لێیان خۆش دەبێت إنشاءالله – وەرگێڕ ﴾.

دووەم : ئەگەر بەشێوەیەك بوو لەهەواو ئارەزوو دەمارگیریەوە بوو تەفسیرکردنەکەی وە ئەو شتەش ڕوویەکی تری هەبوو لەزمانی عەرەبیدا ئەوە لەسنوور دەرچوونەو بێباوەڕی نیە بێجگە لەوە نەبێت کە کەموکورتی و عەیبێك لە مافی خوای گەورەدا بگرێتە خۆ ئەوا ئەو کاتە دەبێتە بێ باوەڕی.

بەشی سێهەم : ئەگەر بەشێوەیەك بوو لەهەواو ئارەزوو دەمارگیریەوە بوو تەفسیرکردنەکەی وە ئەو شتەش ڕوویەکی تری نەبوو لەزمانی عەرەبیدا ئائەوە بێ باوەڕییە لەبەرئەوەی لەڕاستیدا بە درۆخستنەوەیەو هیچ ڕوویەکی تری نیە تابەهۆیەوە بڵێ ئابەو شێوەیەش تەفسیر دەکرێت.

**وێکچوواندن** ﴿ التشبيه ﴾ : دانانی لێکچوویەك بۆ خوای گەورە لەو شتەی کەتایبەتە بەوە وە لە یەکێك لەمافەکانیدا یان لە سیفاتەکانیدا کەئەوەش بێ باوەڕییە

لەبەرئەوەی لە هاوبەش دانانە بۆخوای گەورە ناتەواوی دەگرێتە خۆ لە مافی خوای گەورەدا بەجۆرێك کە چوواندی ﴿ شوبهاندی ﴾ بە دروستکراوێکی ناتەواوە .

وە <u>**هاوشێوە بۆدانان**</u> ﴿ التمثيل ﴾: دانانی هاوشێوەیەك بۆخوا لەوشتەی تایبەتە بەوە وە لە یەکێك لەمافەکانیدا یان لە سیفاتەکانیدا کەئەوەش بێ باوەڕییە لەبەرئەوەی لە هاوبەش دانانە بۆخوای گەورە و بەدرۆخستنەوەی فەرمودەی خوای گەورەیە کەدەفەرموێت: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ﴾ الشورى: ١١ واتە ﴿ هیچ شتێك هاوشێوە و هاووێنەی خوای گەورە نیە ﴾, وەهەروەها ئەم هاوشێوە بۆدانانە ناتەواوی دەگرێتە خۆی لە مافی خوای گەورەدا بە جۆرێك کە کردی بە هاووێنەو هاوشێوەی دروستکراوێکی ناتەواوە وە.

<u>**وەجیاوازیش لە نێوان هاوشێوە بۆدانان و وێکچوواندندا ئەوەیە کە هاو وێنە بۆدانان یەکسانبوون دەخوازێت لەهەموو ڕوویەکەوە بەپێچەوانەی وێکچوواندنەوە.**</u>

## وتەی پێشەوایانی پێشین
## لە بارەی سیفات و ناوەڵناوەکانی خوای گەورەوە

قالَ الإمامُ أبو عبدِ اللهِ أحمدُ بنُ محمدِ بنِ حنبلٍ – رضي الله عنه – في قولِ النَّبي – صلى الله عليه وسلم – «إنَّ اللهَ ينزلُ إلى سماءِ الدُّنْيَا»و«إنَّ الله يُرى في القيامَةِ» وما أشبه هذه الأحاديثَ، قال: نؤمِنُ بها ونُصَدِّقُ بها لا كَيْفَ ولا مَعْنَى ولا نَرُدُّ شيئا منْها، ونَعْلَمُ أنَّ ما جاءَ به الرَّسولُ حقٌّ، ولا نَرُدُّ على رسولِ اللهِ – صلى الله عليه وسلم – ولا نَصِفُ اللهَ بأكْثَرَ مما وَصَفَ بِهِ نفسَهُ، بلاَ حد ولا غايَةٍ :

﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ﴾ ﴿الشورى:١١﴾. ونقولُ كما قالَ، ونَصِفُهُ بما وَصَفَ بِهِ نَفْسَهُ، لا نَتَعَدَّى ذلك، ولا يَبْلُغُهُ وصفُ الواصِفِينَ، نُؤْمِنُ بالقرآنِ كُلِّهِ مُحْكَمُهُ ومُتَشَابِهُهُ ولا نُزِيلُ عَنْهُ صفةً مِنْ صفاتِه لشَنَاعَة شُنِّعَتْ، ولا نَتَعَدَّى القرآنَ والحديثَ، ولا نَعْلَمُ كيفَ كُنْهُ ذلك إلاَّ بتصديقِ الرَّسولِ صلى الله عليه وسلم وتَثْبِيتِ القرآنِ.

پێشەوا أبو عبدالله ئەحمەدی کوڕی موحەمەدی کوڕی حەمبەل ڕەزای خوای لێ بێت لەبارەی فەرمودەکەی پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وعلى آله وسلم کەفەرمویەتی: ﴿ خوای پەروەردگار دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا ﴾ وە ﴿ خوای گەورە دەبینرێت لەڕۆژی قیامەتدا ﴾[1] فەرموویەتی :باوەڕمان پێیەتی و بەڕاستی دادەنێین، نەچۆنیەتیەکەی دەزانین و نەواتای چۆنیەتیەکەیشی، وە هیچ شتێکیشی لێ ڕەد ناکەینەوە، وەدەزانین کە ئەوەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم هێناویەتی هەق و ڕاستە، وەبەهیچ جۆرێ بەرپەرچی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم نادەینەوە بەوەی بڵێین ئەوەی ئەو فەرمویەتی وانیە، وە وەسفی خواش ناکەین بەزیاتر لەوەی وەسفی خۆیی پێکردووە ﴿ واتە چۆن وەسفی خۆیی کردووە ئێمەش هەربەو شێوەیە وەسفی دەکەین و لێی زیاد

[1] تەخریجی ئەم فەرموودانە لە داهاتوودا دێت لەشوێنی خۆیاندا.

ناكەین – وەرگێڕ ﴾ بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە سنورو كۆتاییەكی بۆدابنێین : ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ الشورى: ١١
واتە ﴿ هیچ شتێك هاوشێوە و هاووێنەی خوای گەورە نیە، وەهەر ئەویشە بیسەرو بینایە ﴾.

وەهەروەها خۆی چی فەرمووە ئێمەش هەر ئەوە دەڵێین، وە وەسفیشی بەوە دەكەین خۆیی پێ وەسفكردووە و لەوە زیاتر تێناپەڕین، وەهیچ كاتێك وەسفی وەسكاران ناتوانێت پێی بگات، وە ئێمە باوەڕ بەقورئان دەكەین هەرهەمووی بە موحكەم و موتەشابیهیەوە، وە بەهیچ جۆرێك كاری واناكەین سیفەتێك لەسیفەتەكانی لابدەین و باوەڕمان پێی نەبێت لەبەر قسەیەكی ناشیرین كەكرابێت ﴿لەلایەن كەسانێكەوە بەوەی بلێن ئەمانە هەرلەخۆیانەوە دەڵێن خوا دادەبەزێت، نەخێر بەڵگە دەڵێین باوەڕمان بەوە هەیەو لەخۆمانەوە سیفەتەكانی خوا لانادەین لەبەرقسەو قسەلۆكی خەڵكی دەم بەتاڵ و نەفام – وەرگێڕ ﴾، وە لە قورئان و فەرموودە تێناپەڕین ﴿هەربەو دووانە قسەدەین ئەوەی ئەوان باسیان كردوو جێگیریان كرد ئێمەش دانی پێدا دەنێین و جێگیری دەكەین لەوە زیاتر سنور نابەزێنین – وەرگێڕ ﴾، وە واتا ڕاستەقینەكەی نازانین تەنها بەوە نەبێت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم بەڕاستی داناوە و قورئانیش چەسپاندوویەتی[١].

---

١ بگەڕیوە بۆ (( الصواعق المنزلة )) ی إبن القیم ( ١/ ٢٧٥ )، وە كورتكراوەی (( الصواعق المرسلة )) ی إبن الموصلي ( ٢/ ٢٥١ )، و مناقب الإمام أحمد لابن الجوزي ( ص١٥٦) وە ژیانی پێشەوا ئەحمد لە كتێبی (( التأریخ الإسلامي ص٢٧)).

● زانای پایەبەرز محمد بن صالح العثیمین لە پەرتووكی ﴿ فتح رب البریة في تلخیص الحمویة﴾ دا لاپەڕە ٦٣ دەفەرمووێت : ئەو مانایەی كە پێشەوا ئەحمەد نەیهێشت لە قسەكەیدا بریتیە لەو واتایەی كە ﴿المعطلة﴾ەكان دایان هێنا لە جەهمیەكان و جگە لەوانیش كە دەقەكانی قورئان و سوننەتیان لەڕووكەشەكەی خۆی گۆڕی بۆكۆمەڵە واتایەك كە پێچەوانەیەتی، وەئەوەش بەڵگەیە لەسەرئەوەی كەباسمانكرد پێشەوا ئەحمەد واتاو مانای چۆنیەتیەكەی نەهێشت تا قسەكەی ڕەدی ئەو دوو كۆمەڵە گومڕایە بگرێتە خۆی كەئەوانیش كۆمەڵی ﴿ المعطلة والمشبهة ﴾ن . تەواو.

## ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

ئەوەی قسەکەی پێشەوا ئەحمەد لەفەرموودەکانی دابەزینی خوای گەورەدا گرتوویەیە خۆیی و ئەو گومانانەی لەبارەیەوەن بریتیەلە:

١. پێویستیەتی باوەڕبوون و بەڕاست دانانی ئەوەی لەلایەن پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وعلی آله وسلم هاتووە لەو فەرموودانـەی باسـی سیفەتەکانی خـوای گـەورە دەکەن بەبێ هیچ زیادەخستنە سەرو لـێ کـەمکردن و سـنوربۆدانان و کۆتـایی دیـاری کردنێك.

٢. فـەرمووی نەچـۆنیەتیەکەی دەزانـین و نـە واتـای چۆنیەتیەکەیـشی واتـە: ئێمـە چۆنیەتی بۆئەم سیفاتانە دانانێین لەبەرئـەوەی چـۆنیەتی بۆدانـانی ڕێگـر دەبێـت لـەوەی ڕابورد و مەبەستیش ئەوە نیە کە سیفەتەکانی خۆای گەورە چۆنیەتیەکی نیە لەبەرئـەوەی سیفەتەکانی خوای گەورە جـێگیرو ڕاسـتن وەهـەموو شـتێکی دانپێـدانراو چەسپاویش دەبێت چۆنیەتیەکی هەبێت بەڵام ئەو چۆنیەتیەی سـیفەتەکانی خـوای گـەورە لای ئێمـە نەزانراوە .﴿ واتە لە ڕاستیدا چـۆنیەتی هەیـە بـەڵام ئێمـە نـایزانین چـونکە زانیاریمـان لەبارەیەوە نیە — وەرگێڕ ﴾.

وە وتەکـەی پێـشەوا : ﴿ وەماناکەشـی نـازانین ﴾ بـەواتای ئـەوە دێـت ئێمـە دان بەواتایەکدا نانێین پێچەوانەی ڕووکەشـەکەی بێـت هـەروەکو کۆمـەڵی تـەئویل کـاران کردیان، وەهەروەها وتەکەی پێشەوا ئەحمـەد واتـای ئـەوە نیـە مانـا ڕاسـتەقینەکەی کـە هاوتایە لەگەڵ ڕووکەشەکەیدا نەهێڵێ کەپێشین بەو شێوەیە ڕاڤەیان کردووە لەبەرئەوەی

ئەوە چەسپاوە، ئەوەشی بەڵگە بێت لەسەر ئەوە وتەکەی خۆیەتی کە فەرمووی بەهیچ جۆرێك هیچ شتێك لەوە ڕەد ناکەینەوە و وەسفیشی بەوە دەکەین کە خۆیی پێ وەسفکردووە وە بەهیچ جۆرێك کاری واناکەین سیفەتێك لەسیفەتەکانی لابدەین و باوەڕمان پێی نەبێت لەبەر قسەیەکی ناشیرین کەکرابێت وە واتا ڕاستەقینەکەی ئەوەش نازانین جا ئەو ڕێگریەی بۆ ڕەدکردنەوەی هەرشتێك لێی و ڕێگریەکەیشی بۆ زانینی چۆنیەتیەکەی بەڵگەیە لەسەر دانپێدانانی ئەو واتایەی مەبەست لێیەتی و ویستراوە.

٣. پێویستیەتی باوەڕبوون بەهەموو موحکەمیەوە کەبریتیە لەوەی واتاکەی ڕوونە، وەموتەشابیهیشی کەبریتیە لەوەی واتاکەی ڕوون و ئاشکرا نیە جابۆیە ئێمە موتەشابیە دەگێڕینەوە بۆ لای موحکەم تا واتاکەی ڕوون و ئاشکرا بێت جائەگەر دوای ئەوەیشی موتەشابیهەکەیشمان گێڕایەوە بۆ لای موحکەمەکە هەر واتاکەی ڕوون و ئاشکرا نەبوو ئەوا ئەوکاتە پێویستە باوەڕمان بەلەفزەکەی هەبێت و واتاکەی وازلێبێنین بۆخوای گەورە چونکە خۆی باشتر دەزانێت ماناکەی چیە.

قالَ الإمامُ أبو عبدِ اللهِ محمدُ بنُ إدريسَ الشّافعيُّ رضي الله عنه وآمنتُ باللهِ وبما جاءَ عَن اللهِ على مُرادِ اللهِ، وآمنتُ برسولِ اللهِ وبما جاءَ عَن رسولِ اللهِ على مُرادِ رسولِ الله.

پێشەوا أبو عبدالله محمەدی کوڕی ئیدریسی شافیعی ڕەزای خوای لێ بێت فەرموویەتی: ﴿ باوەڕم بەخوا هەیەو بەوەیشی لەلای ئەوە وە هاتووە، بەوشێوەیەی خۆی ویستوویەتی، وە باوەڕم بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم هەیە و وە بەوەی لەلای پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وعلى آله وسلم هاتووە، بەوشێوەیەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم ویستوویەتی ﴾[1] ﴿ مەبەستی پێشەوا ئەوەیە باوەڕی بە خواو قورئان ئەوەیشی تێیدایە وە باوەڕی بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم هەیە و ئەوەیشی هێناویەتی و ووتویەتی و کردوویەتی و بێ دەنگ بووە لە بەرامبەریدا – وەرگێڕ ﴾.

---

١ بگەڕێرەوە بۆ نامەی ﴿ المدنية لشيخ الإسلام إبن تيمية ص ١٢١ ﴾ لەگەڵ پەرتوکی ﴿ الفتوى الحموية﴾. لشيخ الإسلام إبن تيمية فەرموویەتی: ﴿ ئەوەی کە پێشەوا شافیعی فەرموویەتی ڕاستە پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێکیش باوەڕی وەکو باوەڕەکەی پێشەوا شافیعی وابێت . وەهەرکەسێکیش بەوشێوەیە بوو باوەڕی و قسەیەکیشی نەکرد هەڵیبووەشێنێتەوە ئەوا ئەو کەسە ڕێگەی پارێزراویەتی گرتۆبەر لەدونیاو دوارۆژدا ﴾.
منیش دەڵێم (( لێکۆڵەر )): وەلەقسە گرنگەکانی پێشەوا شافیعی لە بواری ناو و سیفەتەکانی خوای گەورەوە ئەوەیە کە دەفەرمووێت : ﴿ خوای گەورە ناوەکان و ئاوەڵناوەکانی هەیە، هیچ کەسێك ناتوانێت ڕەدیان بکاتەوە لەکاتێکدا بەڵگەی لەسەر چەسپابێت، جا ئەگەر دوای ئەوەی کە بەڵگەی لەسەر چەسپابێت و پێی ووترابێت پێچەوانەی کردوو ڕەدی کردەوە ئەوا ئەو کەسە بێ باوەڕە، بەڵام پێش ئەوەی کە بەڵگەی لەسەر چەسپابێت و پێی ووترابێت ڕەدی بکاتەوە ئەوا ئەو کەسە بیانوی بۆ دەهێنرێتەوە بەوەی نەزانە، لەبەرئەوەی زانینی ئەوە بە عەقڵ و لێوردبوونەوە و بیرکردنەوە هەستی پێناکرێت، بەڵکو ئەو سیفەتانە دەبێت جێگیروچەسپاوبکرێت و لێکچوون و هاوشێوەی لێ دوور بخرێتەوە هەروەکو خۆی لە خۆی دووری خستۆتەوە ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ۝١١ ﴾ الشورى: ١١واتە ﴿ هیچ شتێك هاوشێوە و هاوونەی خوای گەورە نیە، وەهەر ئەویشە بیسەرو بینایە ﴾. بگەڕێوە بۆ ﴿ مختصر العلو للألباني ص ١٧٧، إجتماع الجيوش الإسلامية لابن القيم ص ٥٩ ﴾.

## ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

### ئەوەی قسەکەی پێشەوا شافیعی گرتوویەتیەخۆی

وتەکەی پێشەوا شافیعی ئەمانەی گرتۆتە خۆ:

١. باوەڕبوون بەوەی لەلایەن خواوە هاتووە لە قورئانە ڕوون و ئاشکراکەیدا بەوشێوەیەی خۆی ویستوویەتی بێ هیچ زیادە خستنە سەرێك و کەمکردنێك و گۆڕینێك.

٢. باوەڕبوون بەوەی لەلایەن پێغەمبەری خواوە صلی الله علیە وعلی آلە وسلم هاتووە لە سوننەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وعلی آلە وسلم بەو شێوەیەی کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وعلی آلە وسلم ویستوویەتی بێ هیچ زیادە خستنە سەرێك و کەمکردنێك و گۆڕینێك.

وەلەم قسەیەدا ڕەدی هەریەکە لەوانەی تێدایە کە دەقەکان دەگۆڕن و لەخۆیانەوە ڕاڤەو لێکۆڵینەوەی بۆدەکەن و وەهەروەها ئەوانەی وێنەو هاوشێوە بۆ خوای گەورە دادەنێن، لەبەرئەوەی هەرکام لەوانە باوەڕیان بەوە نیە کەلەلایەن خواو پێغەمبەرەکەیەوە صلی الله علیە وعلی آلە وسلم هاتووە بەوشێوەیەی خواو پێغەمبەرەکەی صلی الله علیە وعلی آلە وسلم ویستویانە، چونکە ئەوانەی دەقەکان دەگۆڕن و لەخۆیانەوە ڕاڤەو لێکۆڵینەوەی بۆدەکەن لەنرخ و بەهایان کەمکردەوە و ئەوانەشی وێنەو هاوشێوە بۆ خوای گەورە دادەنێن لێیان زیادکرد.

وعلى هذا دَرَجَ السَّلَفُ وأَئِمَّةُ الخَلَفِ – رضي الله عنهم –، كُلُّهُمْ مُتَّفِقُونَ على الإقْرارِ، والإمْرارِ والإثباتِ لما وَرَدَ مِن الصِّفاتِ في كتابِ اللهِ وسُنَّةِ رسولِهِ، مِنْ غَيْرِ تَعَرُّضٍ لتأْوِيلِهِ.

وە لەسەرئەوە پێشەوایان لە پێشین و پاشین ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێ بێت هەرهەموویان یەکدەنگن لەسەر ﴿ جێگیرکردن و تێپەڕاندن و چەسپاندن ﴾ لەبارەی ئەو شتانەی هاتووە دەربارەی سیفەتەکانی خوای گەورە لە قورئانەکەی خواو و سوننەتی پێغەمبەرەکەی صلی الله علیە وعلی آلە وسلم بە بێ بەگژداچوونەوە بۆ ڕاڤەکردنی بەمەبەستی تێکدان و گۆڕینی.

**ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین**

ڕێگەو ڕێبازی پێشین لەبارەی سیفەتەکانی خوای گەورەوە :

ئەوڕێگەیەی پێشین دەربارەی سیفەتەکانی خوای گەورە گرتوویانە بەر بریتیە لە جێگیرکرن و چەسپاندن لەبارەی ئەو شتانەی هاتووە دەربارەی سیفەتەکانی خوای گەورە لە قورئانەکەی خواو و سوونەتی پێغەمبەرەکەی صلی الله علیە وعلی آلە وسلم بە بێ بەگژداچوونەوە بۆ ڕاڤەکردنی بەمەبەستی تێکدان و گۆڕینی بەوەی کە ناگونجێت لەگەڵ ویستی خواو پێغەمبەرەکەی صلی الله علیە وعلی آلە وسلم .

## هاندان بۆ پەیرەوکردنی سوننەت و هۆشیاریدان لە داهێنان لە دیندا

وقد أُمِرْنا بالاقْتِفَاءِ لآثارِهِمْ والاهتداءِ بمنارِهِم، وحُذِّرْنا المُحْدَثاتِ، وأُخْبِرْنا أنّها مِنَ الضَّلالاتِ، فقالَ النبيُّ – صلى الله عليه وسلم – «عَلَيْكُم بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاء الرّاشِدِينَ المَهْدِيّينَ مِنْ بَعْدِي، عَضّوا عَلَيْهَا بِالنّوَاجِذِ, وَإِيّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الأمُورِ, فَإِنّ كُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ, وَكلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ».

وەبەدڵنیاییەوە فەرمانمان پێکراوە بەشوێن هەڵگرتنەوەی شوێنەوارەکانیان وە ئەوانە بکەینە نیشانەی هیدایەت و ڕێنمایی وەرگرتنمان، وەئاگادارکراوینەتەوە لەو شتانەی داهێنراوە لە دینەکەی خوای گەورەدا، وە هەواڵمان پێدراوە کەئەو شتە تازە داهێنراوانە لە گومڕاییەکانن هەرلەبەرئەوەش پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آلە وسلم :﴿ عَلَيْكُم بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاء الرّاشِدِينَ المَهْدِيّينَ مِنْ بَعْدِي، عَضّوا عَلَيْهَا بِالنّوَاجِذِ, وَإِيّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الأمُورِ, فَإِنّ كُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ, وَكلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ﴾ واتە : ﴿ئاگادارتان دەکەمەوە بە سوننەتەکانم وە بەسوننەتی خەلیفەکانی ڕاشدینی ڕێنمویی کراو، بە ددانەکانتان تووند قەپی پیابکەن، وەئامان ئاگادارتان دەکەمەوە لەو شتە نوێیانەی کەدادێت لەدیندا ، لەبەرئەوەی هەموو داهێنراوێك بیدعەیەو هەموو بیدعەیەکیش لەدیندا گومڕاییە ﴾.

## ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

شوێن پێهەڵگرتنی ئەوان لەوەدا پێویستە لەبەرفەرموودەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم کەفەرمووی :﴿ عَلَيْكُم بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِـدِينَ الْمَهْـدِيِّينَ مِـنْ بَعْـدِي، عَضّوا عَلَيْهَا بِالنّوَاجِذِ, وَإِيّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الأمُورِ, فَإِنّ كُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ, وَكلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ ﴾.

واته :﴿ئاگادارتان دەکەمەوە بە سوننەتەکانم‌و بەسوننەتی خەلیفەکانی ڕاشـدینی ڕێنمـویی کراو، بە ددانەکانتان توند قەپی پیابکەن، ئامان ئاگادارتان دەکەمەوە لـەو شـتە نوێیانـەی کـە دادێت، لەبەرئـەوەی هـەموو داهێنراوێـك بیدعەیـەو هـەموو بیدعەیـەکیش گومڕاییـە﴾ ئـەم فەرموودەیە پێشەوایان ئەحمەدو ئـەبو داودو ترمـزی ڕیوایـەتیان کـردوەو ترمـزی فەرمویـەتی ﴿حسن صحیح﴾و شێخی ئـەلبانیش بـە صـەحیحی دانـاوەو جەماعـەش بەهـەمان شـێوە بـە صەحیحیان داناوە.[1]

---

١ فەرموودەیەکی صەحیحە :
پێشەوا ئەحمەد لە موسنەددا بەژمارە (٤/١٢٦,١٢٧ ) ڕیوایەتی کردووە .
وە ئەبوداودیش لە كتاب السنة : باب في لزوم السنة بەژمارە ( ٤٦٠٧ ) ڕیوایەتی کردووە.
وە ترمزیش لە كتاب العلم : باب ماجاء في الأخذ بالسنة وإجتناب البدعة بەژمارە ( ٢٦٧٦ ).
وە ئیبن و ماجەش لە پێشەکیدا :باب إتباع السنة الخلفاء الراشدين المهدين بەژمارە ( ٤٢,٤٣) ڕیوایـەتیکردووە، وە الـدارمي (١/ ٤٤)، وغـبن حبـان (١٠٢ –المـوارد )، والحـاكم (١/٩٧) وغـبن أبـي عاصـم في الـسنة ( ص ١٧: ٢٠,٢٩,٣٠)، والبيهقي في دلائل النبوة (٦/ ٥٤١) وابن عبدالبر في جامع بيـان العلـم وفـضله ( ١/ ٢٢٤:٢٢٢)، من حديث العرباض بن سارية أبي نجيح رضي الله عنه، وقد صححه غير واحد من أهل العلم : فقال الترمذي ﴿ حسن صحيح ﴾ وصححه الحاكم وأقره الذهبي، ونقل ابن عبدالبر عن أبي بكر احمد احمد بن عمـرو البـزار قولـه ﴿ حـديث العرباض في الخلفاء الراشدين صحيح ثابت ﴾ ثم قال : وهو كما قال، وصححه شيخ الإسلام ابن تيمية في غير موضع ( ٢٠/٣٠٩) مجموع الفتاوى وفي اقتضاء الصراط المستقيم ( ٢/ ٥٧٦)، أما تصحيح الألباني الذي أشار اليـه الـشيخ ففي صحيح الجامع الصغير ( ٢/ ٣٤٦) وفي تخريج السنة لابن أبي عاصم ص (١٧:٢٠)، ص (٢٩, ٣٠).
سوودێك ::
قال الحافظ بن رجب في الجامع العلوم والحكم ص(٣٦٥) في شـرحه لهـذا الحـديث في الكـلام علـى محـدثات الأمـور وتعديدها :﴿ وەلـەوەش قورسـتر ئەوەیە کە ڕوویداوە لەقسـەکردن لـەبارەی زاتی خواوە و سیفەتەکانیەوە لـەوە دا کـە پێغەمبەرو صلى الله عليه وعلى آله وسلم هاوەڵان و شوێنکەوتوانی ئەوان بەچاکە ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێ بێـت لـە ئاستیدا بێدەنگ بوون . جا کۆمەڵێك زۆرێك لەسـیفەتەکانی خـوای گـەورەیان نـەهێڵاوە لەکاتێکـدا لـە قورئـان و سـونەتدا هاتووە، وەواش گومان دەبەن کەئەو کارەیان لەبەرئەوەکردووە خوای گەورە بەپاك و بێگەرد ڕابگـرن لـەو شتەدا کەعەقڵ وادەخوازێت بەپاك و بێگەردی ڕابگرێت، وەا گومانیان بردووە کە بوونی ئەو سیفەتە بۆخوای پـاك و بێگەرد نەگونجاوە، وەکۆمەڵێکی تریش هەر بەوە وە نەوەستاون ئە سیفەتانەی بۆ دابنێن و جێگیری بکەن تا شتانێکیان بۆ بەسیفەت داناوە بەگومانی خۆیان کە دەبێت هەبێت لەبەرامبەر سیفەتی دروستکراوەکاندا ، ئەم پەیوەستکردنانە بە هەردوو جۆرەکەی ﴿ نفيا وإثباتا ﴾ پێشینەی ئەم ئوممەتە لەئاستیدا بێدەنگیان هەڵبژاردوە ﴾ تەواو

## سوننەت و بیدعەت و حوکمی هەریەکە لەو دووانە

**سوننەت** لە زامانەوانیدا بەواتای ڕێگە دێت، وەلەزاراوەی شەرعیشدا بریتیە لەوەی کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم و هاوەڵانی ڕەزای خوایان لێ بێت لەسەری بوون لەبیروباوەڕو کردەوەدا .

وەشوێن کەوتنی سوننەت پێوسیتە لەبەرئەوەی خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْآخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب: ٢١واتە ﴿ بەڕاستی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم چاکترین نمونەی ڕێك و پێکی و سەرمەشقەبۆتان بەتایبەتی بۆئەوکەسە کەبەهیوای خواو ڕۆژی دوابیە ﴾.

وەلەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم کەفەرمووی ﴿عليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين المهديين عضوا عليها بالنواجذ﴾ واتە ﴿ئاگادارتان دەکەمەوە بە سوننەتەکانم وە بەسوننەتی خەلیفەکانی ڕاشدینی ڕێنمویی کراو، بە ددانەکانتان تووند قەپی پیابکەن ﴾.

وە **بیدعەت** لەزمانەوانیدا بریتیە لەهەرشتێکی تازە پەیدابوو .

وەلەزاراوەی شەرعیشدا : بریتیە لەو شتەی داهێنراوە لەدینداو پێچەوانەی ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم و هاوەڵانی ڕەزای خوایان لێ بێت لەسەری بوون لەبیروباوەڕو کردەوەدا .

وەئەوەش حەرام و قەدەغەکراوە لەبەر فەرمایشتی خوای گەورە کە دەفەرمووێت: ﴿ وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلْهُدَىٰ وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ ٱلْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصْلِهِۦ جَهَنَّمَ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴿١١٥﴾ ﴾ النساء: ١١٥ واتە ﴿هەرکەسێك پاش

ئەوەی ڕێگەی هەق و ڕاستی بۆدەرکەوت و شارەزایی دینی خوا بوو دژایەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم بکات و ڕێگاو ڕێبازێ بگرێتە بەر کەڕێگای ڕاستی باوەڕداران نەبێت ئێمەش ڕووی ئەکەینە ئەو بەرنامەوڕێگایە بەئارەزووی خۆی لەدونیادا هەڵیبژاردووە ئیتر ئێمە وازی لێدێنین و هەقمان نیە بەسەریەوە و لەقیامەتیشدا دەیخەینە ناو ئاگری تاودراوی دۆزەخەوە ئای کە دۆزەخ جێگاو ڕێگایەکی خراپە﴾.

وەهەرلەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم کەفەرمووی ﴿وإیاکم ومحدثات الأمور فإن كُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ﴾ واتە: ﴿وەئامان ئاگادارتان دەکەمەوە لەو شتە نوێیانەی کەدادێت لەدیندا ، لەبەرئەوەی هەموو داهێنراوێك بیدعەیەو هەموو بیدعەیەکیش لەدیندا گومڕاییە ﴾.

⟸ وەهەروەها عبدالله ی کوڕی مەسعود ڕەزای خوای لێ بێـت دەفـەرموویێت : ﴿اتَّبِعُوا وَلا تَبْتَدِعُوا، فَقَدْ كُفِيتُمْ﴾[1]

واته : لـه عبد الله بن مـسعود d دەفـەرموێت :﴿ شـوێنکەوتوو بـن ، وهیـچی تـازه دامەهێنن چونکه ئەوەتان بەسه ﴾.

⟸ وه عومەری کوڕی عبدالعزیزیش ڕەزای خوای گـەورەی لێ بێـت قـسەیەکی هەیه واتاکەی بەم شێوەیەیه ﴿قِفْ حيثُ وَقَفَ القومُ، فَإِنَّهُم عَنْ عِلْمٍ وَقَفُوا، وبِبَصَرٍ نافِـذٍ كَفُّوا، وَلَهُمْ عَلَى كَشْفِها كانوا أَقْوَى، وبالفَضْل لوْ كانَ فيها أَحْـرَى، فَلَـئِنْ قُلْـتُمْ حَـدَثَ بَعْدَهُم، فَمَا أَحْدَثَهُ إلا مَنْ خَالَفَ هَدْيَهُمْ، وَرَغِبَ عَنْ سُنَّتِهِمْ، ولقَدْ وَصَفُوا مِنْهُ ما يُـشْفِي،

---

[1] وتەیەکی ڕاست و دروسته: کەبێگومان لەکەسـێك زیـاتر ئـەو وتەیـەیان لـە إبـن مـسعودەوە d ڕیوایەت کردووه، لەوانه:

١. أبو عبدالرحمن السلمي : أخرجـه الـدارمي (٢١١) والطبرانـي في الكـبير (٨٨٧٠) والبيهقـي في المدخل (٢٠٤) وإبن وضاح في البدع والنهي عنها ص(١٠) كلهم من طريق الأعمش عن حبيب بـن أبي ثابت عنه وقال الهيثمي في المجمع (١٨١/١) ((ورجاله رجال صحيح )). قلت : لكن الإسناد فيـه عنعنة الأعمش وعنعنة حبيب بن أبي ثابت وكلاهما مدلس .

٢. أبراهيم النخعي : أخرجه أبو خيثمة في العلم (٥٤) من طريق العلاء عن حماد عنه وصحح إسـناده الألباني حيث قال (( وهذا إسناد صحيح، فإبراهيم وإن كان لم يدرك عبدالله وهـو إبـن مـسعود فقـد صح عنه أنه قال : إذا حدثتكم عن رجل عن عبدالله فهو الذي سمعت، وإذا قلت : قـال عبـدالله فهـو واحد عن عبدالله )).

٣. قتادة : أخرجه إبن وضاح في البدع والنهي عنها ص(١١) من طريق أبي هلال عنه وأبوهلال هذا هو محمد بن سليم صدوق وفيه لين أخرج له البخاري في التعاليق.

وبالجملة فأثر إبن مسعود بهذه طرق صحيح بلا ريب والله أعلم.

وتَكَلَّمُوا مِنْه بما يَكْفي، فَما فَوْقَهُم مُحَسِّرٌ، وما دونهم مُقَصِّرٌ، لَقَدْ قَصُرَ عَنْهُم قَوْمٌ فَجَفَوْا، وَتَجاوَزَهُمْ آخَرُون فَغَلَوْا، وإِنَّهُمْ فِيما بَيْنَ ذَلِكَ لَعَلَى هُدًى مستقيمٍ ﴾[1]

واته: ﴿ بووەستە لەو شوێنەدا کە پێشینە چاکەکان لەبارەی ناو و ئاوەڵناوەکانی خوای گەورەوە وەستاون، لەبەرئەوەی ئەوان زانیویانە کە دەبێت چۆن ڕەفتاربکەن لەو بارەوە بۆیە وەستاون، وە بە بینینێکی تەواوە دەستیان هەڵگرتووە (( بەچاوێکی کاریگەرو ئاگادارەوە دەستیان هەڵگرتووە لەوەی کە باسی بکەن – وەرگێڕ ))، وە ئەوان لەسەر دۆزینەوەی و دەرخستنی واتاکەی ئەگەر ویستیان لێ بووایە بەهێزترین کەس بوون، وە ئەگەر بە پێویستیان بزانیایە زیادە خستنە سەری و زۆر دووان لێی باشە لەبەرترو شایستەتربوون، جائەگەر وتتان ئەم شتە لەدوای ئەوانەوە ڕوویداوە و داهاتووە، ئایە ئەو کەسەی دایهێناوە کێیە جگە لەکەسێك نەبێت کە پێچەوانەی ڕێوشوێنی هاوەڵان و شوێنکەوتووانی ئەوانی کردووە، وە وازی لە شوێنکەوتنی ڕێوشوێنی هاوەڵان و شوێنکەوتووانی ئەوان هێناوە، وە بێگومان هاوەڵان و شوێنکەوتووانی ئەوان ئەوەندەیان لێ وەسفکردووە کە چارەسەر بێت، وەئەوەندەش قسەیان لەبارەوە کردووە کە بەس بێت، جا هەرکەسێك خۆی لەسەرووی ئەوانەوە ببینێتەوە و بیەوێ زیاتر لەوان بدوێ و بزانێ ئەوا خۆی ماندوو دەکات و دەست بەتاڵ

---

[1] الأثر أورده إبن قدامةفي كتابه في كتابه البرهان في بيان القرآن ص(٨٨,٨٩) من قول عبدالعزيز بن أبي الاجشون ثم قال ( وروى معناه عن عمر عبدالعزيز ).

وقد أورده الحافظ ابن الجوزي في مناقب عمر عبدالعزيز ص (٨٣,٨٤)، وأورد الحافظ ابن رجب طرفا منه مع اختلاف يسير في رسالته فضل علم السلف ص(٣٦) وهي قوله (( إن السابقين عن علم وقفوا، وببصر ناقد كفوا، وكانوا هم أقوى على البحث لو بحثوا ))أ.هـ . يشير بهذا إلى أن سكوتهم كان عن علم وخشية وليس سكوت عجز وعي، وأن توسع من توسع بعدهم لا يدل على أنهم أعلم منهم . وراجع في هذا المعنى فضل علم السلف ص (٣٦: ٤١).

كفوا : دەسیان لێ هەڵگرتووە، بالفضل : بەزیادە خستنە سەر، محسر : لە حسرەوە هاتووە کە بریتە لە بێ توانایی، جفوا : لە ﴿ الجفاء ﴾ەوە هاتووە کە بریتیە لە دوور کەوتنەوە، غلوا : بریتیە لە سنووردەرچوون.

دەبێت و هیچی دەست ناکەوێت، وەهەرکەسێکیش بەو ئاستەوە نەوەستێت لەوەی ئەوان ووتویانە بەزیادی بزانێ و خۆی بەباشتر بزانێ ئەوا کەم تەرخەمی و کوتڕەوی کردووە، بێگومان خەڵکانێك هەن بەوەی ئەوان کردوویانە و ووتویانە ڕازینەبووە بۆیە بوونە کەسانێکی ئاسانکارو گوێپێنەدەر، وە خەڵکانێکی تر هەبوون بەوەی ئەوانەوە نەوەستا و تێپەڕاندن بۆیە ڕۆچوون لەوبارەوە و زیادەڕەویانکرد، وە ئەوانەیشی لە نێوان ئەو دوو کۆمەڵەدا بوون لەسەر هیدایەت و ڕێنماییەکی ڕاست و دروستن ﴾.

⟸ وقالَ الإمامُ أبو عمْرٍو الأوزاعيُّ – رضي الله عنه – "عليْكَ بآثارِ مَنْ سَلَفَ وإنْ رَفَضَكَ النّاسُ، وإيّاك وآراءَ الرِّجالِ وإنْ زَخْرَفُوهُ لَكَ بالقوْلِ

وەهەروەها پێشەوا أبو عمْرٍو الأوزاعيُّ - رضي الله عنه دەفەرمووێت : ﴿عليْكَ بآثارِ مَنْ سَلَفَ وإنْ رَفَضَكَ النّاسُ، وإيّاك وآراءَ الرِّجالِ وإنْ زَخْرَفُوهُ لَكَ بالقوْلِ ﴾[1]

واتە ﴿ پێویستە لەسەرت کە دەست بە ڕێوشوێنی پێشینەوە بگریت ئەگەر خەڵکیش نەیان ویستیت و پشتیان تێکردیت، وە ئامان ئاگاداری بیروبۆچوونی خەڵکی بە ئەگەر بەقسەش بۆیان ڕازاندیتەوە ﴾.

---

١ أثر صحيح : أخرجه الخطيب في شرف أصحابالحديث ص(٧)، والآجري في الشريعة ص(٥٨)، وعنه ابن عبدالبر في جامع بيان العلم وفضله ( ٢/ ١٤٤) من طريق العباس بن الوليد بن مزيد البيروتي، قال: (( أخبرني أبي قال: سمعت الأوزاعي يقول : فذكره )) .

وهذا إسناد صحيح . وأما قول الحافظ في التقريب (٣٩٩/١) عن العباس بن الوليد أنه صدوق فتعقب، فقد وثقه ابن أبي حاتم والنسائي وابن حبان وغيرهم في التهذيب ( ٥/ ١١٥,١١٦) والجرح والتعديل(٢١٦/٢) وطبقات الحنابلة (٢٣٥/١).

والأثر أورده الحافظ الذهبي في سير أعلام النبلاء (١٢٠/٧) وفي العلو للعلي الغفار وصحح الألباني إسناده في مختصره للعلو ص(١٣٨).

## ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

ئەو وتانەی هاتوون لەبارەی هاندان بۆ پەیڕەوکردنی سوننەت و هۆشیاریدان لە بیدعەو داهێنراوەکان:

١- لە وتەکانی هاوەڵان : هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەر صلی الله علیه وعلی آله وسلم عبدالله ی کوڕی مەسعودە ڕەزای خوای لێ بێت کەلەساڵی ٣٢کۆچی مردووە لەتەمەنی شەست و ئەوەندە ساڵیدا، دەفەرموویێت : **اتَّبِعُوا** : واتە شوێن وتەو کردارەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وعلی آله وسلم بکەون بەبێ ئەوەی هیچ زیادەیەکی بخەنە سەرو لێی کەم بکەنەوە، وەکو خۆی چۆنە ئاوا شوێنی بکەون **وَلَا تَبْتَدِعُوا** هیچ بیدعەو زیادەیەك لە دیندا دامەهێنن **فَقَدْ كُفِيتُمْ** چونکە ئەوانەی لە پێش ئێوە وە بوون کاروباری دینەکەتانیان بۆ تەواو کردن کەئەوانیش پێشینەچاکەکانن بەجۆرێك خوای پەروەردگار دینەکەی بۆ پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وعلی آله وسلم تەواوکرد ئایەتی خۆی دابەزاند کەدەفەرموویێت : ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ﴾ المائدة: ٣ واتە ﴿ئەمڕۆ دینەکەتانم بۆ تەواوکردن﴾ ئیتر لەدوای ئەوە وە دین پێویستی بە تەواوکردن نیە چونکە خۆی تەواوە و کەم و کورتی نیە.

٢- لە وتەکانی شوێن کەوتووانی هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وعلی آله وسلم وتەکەی ئەمیری ئیمانداران عومەری کوڕی عبدالعزیزە کەلەساڵی ٦٣لەدایك بووە و لەساڵی ١٠١دا مردووە کە تیایدا ئەمانە دەگرێتە خۆی :

أ- پێویستیەتی وەستان لەو شتەی ئەوان لەئاستیدا وەستاون کەمەبەستی پێغەمبەر صلی الله علیه وعلی آله وسلم و هاوەڵەکانیەتی لەو شتەی لەسەری بوون لەبواری بیروباوەڕو کردەوەدا لەبەرئەوەی ئەوان لەسەر بوونە زانست و زانیاری و بینینێکی تەواوە وەستاون وەئەگەر خێر لەو شتەدا بووایە کەلەدوای ئەوانەوە داهێنراوە ئەوا

بێگومان ئەوان لەبەرترو شایستەتربوون بەوەی دایان بهێنایە بەڵام چونکە خێری تێدا نەبووە ئەوان کاری وایان نەکردووە و ئاینەکەی خوایان تێکنەداوە .

ب- ئەوەی لەدوای ئەوانەوە داهێنراوە هیچ نیە تەنها پێچەوانەکردن و دژایەتی کردنی ڕێوشوێنی پێغەمبەر صلی الله علیه وعلی آله وسلم و هاوەڵەکانیەتی وە وازهێنانو دوورکەوتنەوەیە لە سوننەتیان، وەئەگەر نا ئەوان دینیان بەوە وەسفکردووە کە چارەسەر بێت وەئەوەندەش قسەیان لەسەرکردووە کەبەس بێت و ڕۆنەچوون تێیدا.

ج- لەناو خەڵکیدا کەسانێك هەن کەمتەرخەم بوون لە شوێنکەوتنیاندا جابۆیە کورترەو ووشکهەڵگەڕاوبووە، وەهەندێکی تر هەبوون لەو ئاستەدا نەوەستاون ئەوانی لێ وەستان بۆیە ڕۆچوون و بەرەو تیاچوون ڕۆیشتن، وە ڕێگەی ڕاستیش لەنێوان ئەو دووانەدایە کە توندڕەویی و کورترەوییە .

٣- لەوتەکانی شوێنکەوتوانی شوێنکەوتواندا ﴿ تابعي تابعين ﴾: وتەکەی پێشەوا ئەوزاعیە ﴿ عبدالرحمن ی کوڕی عمرە کەلەساڵی ١٥٧دا مردووە ﴾ کە دەفەرموویێت: ﴿علیْكَ بآثارِ مَنْ سَلَفَ ﴾ پەیوەست بە بە ڕێگەی هاوەڵان و شوێنکەوتووانیانەوە بەچاکە لەبەرئەوەی بونیادنراوە لەسەر قورئان و سوننەت.

﴿وإنْ رَفَضَكَ النّاسُ ﴾ ئەگەر چیش دووریان خستیتەوە و نەیان ویستیت.

﴿وإيّاكَ وآراءَ الرِّجالِ ﴾ ئاگاداری بۆچوونی خەڵکی بە کەئەوەش بریتیی لەوەی ووتراوە و تەنها بۆچوونێکە بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکی لەسەر بێت لەقورئان و سوننەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم .

﴿وإنْ زَخْرَفُوهُ ﴾ بابیشی ڕازێننەوە : واتە لەکاتی دەربڕینیدا جوانی دەکەن و دەیڕازێننەوە بەڵام دەبێت ئەوە بزانین کە ناهەق نابێت بە هەق بەوەی جوانی بکەن و بیڕازێننەوە. ﴿ چونکە هەموو قسەو کردەوەیەکی پووچ هەر پووچ و ناهەقە باکەسانێکی دەم لوس و قسەزانیش بیڕازێننەوە – وەرگێڕ ﴾.

⇦ وقالَ محمدُ بنُ عبدِ الرحمنِ الأَذْرَمِيُّ لرَجُلٍ تكَلَّمَ ببدْعَةٍ وَدَعَا الناسَ إليها: هَلْ عَلِمَهَا رسولُ اللهِ – صلى الله عليه وسلم – وأبو بكْرٍ وعمرُ وعثمانُ وعليٌّ أوْ لَم يعلَموها؟ قال: لَم يعلَموها، قال: فَشَيْءٌ لَم يعلَمْه هؤلاء أَعلِمْتَهُ أنتَ؟ قال الرَّجلُ: فإنّي أقولُ قدْ علِمُوها، قال: أَفَوَسِعَهُمْ أنْ لا يتَكَلَّمُوا به ولا يدْعُوا الناسَ إليه، أمْ لَم يَسَعْهُمْ؟ قال: بَلْ وَسِعْهُمْ، قال: فَشَيْءٌ وَسِعَ رسولَ اللهِ – صلى الله عليه وسلم – وخلفاءَه، لا يَسَعُكَ أنتَ؟ فانْقَطَعَ الرَّجلُ، فقال الخليفةُ، وكان حاضِرا: لا وَسَّعَ اللهُ على مَنْ لَم يَسَعْهُ ما وَسِعَهُمْ.

وەهەروەها موحەممەدی کوڕی عبدالرحمانی ئەدرەمی بەپیاوێکی ووت کەقسەی بۆ خەڵکی دەکرد و قسەکانی بیدعەو داهێنراو بوو وە خەڵکیشی بۆلا بانگ دەکرد:

﴿ئایە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم و ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان و عەلی ڕەزای خوا لە هەر چواریان بێت ئەو شتەی تۆ بانگەوازی خەڵکی بۆ لا دەکەیت دەیانزانی یان نەیان دەزانی ؟ کابرا وتی : نەیاندەزانی، ئەویش فەرمووی شتێك ئەوپیاوانە نەیانزانی بێت ئایە تۆ دەیزانیت ؟!! پیاوەکە وتی من دەڵێم بێگومان زانیویانە, پاشان موحەممەدی کوڕی عبدالرحمانی ئەدرەمی وتی : ئایە ئەوانە توانیان قسەی تیادا نەکەن، وە خەڵکیشی بۆ لابانگ نەکەن یان نەیانتوانی ؟ کابرا وتی : بەڵێ دەشتیان توانی ئەو کارە بکەن بەڵام نەیانکردووە، پاشان موحەممەدی کوڕی عبدالرحمانی ئەدرەمی وتی : شتێك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم و ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان و عەلی ڕەزای خوا لە هەر چواریان بێت توانیبێتیان بیکەن و نەشیان کردبێت ئایە تۆ ناتوانیت نەیکەیت و وازی لێ بهێنیت؟!! پیاوەکە قسەکانی بڕی و کۆتای پێ هێنا، خەلیفەی ئەو کاتەش لەوێدا ئامادەبوو دوای ئەو گفتوگۆیە وتی : دەك خوا مۆڵەت و توانایی نەدات بە کەسێك کەکارێك بکات لەو شتەدا کەئەوانە نەیانکردبێت و ڕازی نەبێت بەوەی ئەوان پێی ڕازیبوون﴾.

⟸ وهكذا مَنْ لَم يَسَعْهُ ما وَسِعَ رسولَ اللهِ – صلى الله عليه وسلم – وأصحابَه والتَّابعين لَهُم بإحسانٍ، والأئمةَ مِنْ بَعْدِهِمْ، والرّاسِخين في العِلْم، مِنْ تِلاوَةِ آيات الصِّفاتِ وقِراءَةِ أخْبارِها، وإمْرارِها كما جاءَت، فلا وَسَّعَ اللهُ عليه.

وەهەروەها هەرکەسێك جێی نەبێتەوە لەودینەدا کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم وهاوەڵانی و شوێنکەوتووە چاکەکانیان تێیدا جێیان بووەوە، وە ئەو پێشەوایانەی لەدوای ئەوانەوە هاتن و زۆر شارەزابوون و ڕۆچووبوون لە زانست و خوێندنەوەی ئایەتەکانی سیفەتەکانی خوای گەورەدا و خوێندنەوەی هەواڵەکانی و تێپەڕاندنی و دەست لێنەدانی سەرەڕای ئەوەش هەر ڕازی نەبێت و بە بۆچوونی خۆی لەبارەیانەوە بدوێت دەك خوای پەروەردگار هەرگیز جێی نەکاتەوە و نەتوانێت خۆی لەو دینە فراوانەدا ببینێتەوە.

## ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

ڕوودانی گفتوگۆ و چاوپێکەوتنێك لەنێوان ئادرەمی و کابرای خاوەن بیدعەدا لەلای خەلیفەدا:

شارەزایم لەسەر ژیانی ئادرەمی و ئەو کەسەیشی لەگەڵیدا بووە نیە وەهەروەها نازانم جۆری ئەو بیعدەیەی باسکراوە چی بووە[1] بەڵام ئەوەی گرنگ بێت ئەوەیە کە بزانین

---

١ القصة أخرجها الخطيب في تاريخ بغداد ( ٧٥/١٠ ) ومن طريقه إبن الجوزي في مناقب الإمام أحمد ص(٤٣٦:٤٣١) ومن طريقه إبن قدامة في التوابين ( ص١٩٤ ) وأخرجها الذهبي في سير أعلام النبلاء ( ٣١٣/١١) والآجري في الشريعة ص (٩١: ٩٥ ) وأوردها ابن كثير في البداية والنهاية ( ١٠ / ٣٣٥ ).

وقد رويت القصة من طريقين أحدهما مطول والآخر مختصر وقال الحافظ الذهبي بعد ذكر الطريقة المختصرة للقصة : (( هذه قصة مليحة وإن كان في طريقها من يجهل ولها شاهد )) ثم ذكر لها الطريق المطول .

ويظهر من كلام الشيخ العثيمين رحمه الله أن في هذه القصة مبهمات الأربعة : الأردمي، والناظر له، والخليفة الذي حظر المناظرة، والبدعة التي جرت المناظرة بسببها . ومن خلال التعرف على شخصية المناظر تتبين لنا بقية المبهمات.

**الأول :** الأدرمي : والذي نستطيع تأكيده أنه مصَحَّف من الأذرمي واسمه أبوعبدالرحمن عبدالله بن محمد بن إسحاق الأذرمي روى عن وكيع وإبن عيينة وإبن مهدي وغيرهم وروى عنه أبوداود والنسائي . وهو صاحب القصة المذكورة كما جاء في المصادر التي وردت بها القصة وكما رجح غير واحد من أهل العلم فروى الخطيب في تأريخه

ئەو قۆناغانە کامایە ئەم گفتوگۆ و چاوپێکەوتنەی پێدا تێپەڕبووە تابەهۆیەوە ڕێگەیەك بەدەست بێنین شارەزایی چۆنیەتی گفتوگۆکردن ببین کە لە نێوان دووکەسدا ڕوودەدات کاتێك گفتوگۆدەکەن لەسەر شتێك .

---

(١٠/٧٧،٧٨) وابن الجوزي في المناقب ص(٤٣٦) أن الحافظ أبابكر أحمد بن عبدالرحمن الشيرازي حدَّث بهذه المناظرة ثم قال (( الشيخ هو عبدالرحمن عبدالله بن محمد بن إسحاق الأذرمي ))أ.هـ

وقال الخطيب في تأريخه ( ١٠/ ٧٥) : (( وكان هارون الواثق بالله أشخص شيخا من أهل إذنه للمحنة وناظر إبن أبي داود بحضرته واستعلى عليه الشيخ بحجته فأطلقه الواثق وردَّه إلى وطنه، ويقال : إنه كان أبا عبدالرحمن الأذرمي )) أ.هـ

وقال الخطيب في التهذيب (٦/٥) بعد أن ذكر كلام الخطيب : قلت : القصة مشهورة حكاها المسعودي وغيره، ورواها السياري في الألقاب بإسناد له قال فيه : إن الشيخ المناظر هو الأذرمي هذا )) أ.هـ

وقال السمعاني في الأنساب ( ١/ ٦٢) في مادة: الأذرمي : بعد الألف وفتح الذال المعجمة وسكون الراء، وفي آخرها الميم، هذه نسبة إلى آذرم، وظني أنها من قرى أذنة بلدة من الثغر منها أبو عبدالرحمن عبدالله بن محمد بن إسحاق الآذرمي .... ثم ترجع له وذكر مثل كلام الخطيب .

الثاني: المناظر له وهو أحمد بن أبي داود : القاضي الكبير أبو عبدالله أحمد بن فرج بن حريز الإيادي البصري البغدادي الجهمي عدو أحمد بن حنبل . **كان داعية إلى خلق القرآن** كانت له منزلة ومشورة عند الخليفة المأمون والمعتصم والواثق وكان إلبا على الإمام أحمد يوم المحنة يقول يا أمير المؤمنين اقتله هو ضال مضل راجع ترجمته في: وفيات الأعيان (٨١/١) وسير أعلام النبلاء (١٦٩/١١) والبداية والنهاية (١٠/ ٣١٩) وشذرات الذهب (٩٣/٢).

الثالث: الخليفة الذي حضر المناظرة هو الواثق بالله هارون بن محمد (المعتصم بالله ) بن هارون الرشيد العباسي أبو جعفر من خلفاء الدولة العباسية بالعراق ولد ببغداد وولى الخلافة بعد وفاة أبيه سنة ٢٢٧ هـ **فامتحن الناس في خلق القرآن وسجن جماعة، والظاهر أنه تاب عن ذالك في آخره عمره** كما جاء في سياق روايات القصة التي نحن بصدد الكلام عليها ففي آخرها قال المهتدي بالله ابن الخليفة الواثق بالله : (( **فرجعت عن هذه المقالة، وأظن أن الواثق رجع عنها منذ ذالك الوقت** )) أ.هـ .

وقد عنون الحافظ ابن قدامةفي التوابين ص(١٩٤) لهذه القصة بقوله **( توبة الواثق بالله وابنه المهتدي بالله )** .

وقال الحافظ ابن الجوزي في مناقب الإمام أحمد ص(٤٣١) : (( وقد روى أن الواثق ترك إمتحان الناس بسبب مناظرة جرت بين يديه رأى بها أن الأولى ترك الإمتحان )) ثم ساق القصة بطولها .

الرابع: البدعة التي جرت المناظرة بسببها : هي بدعة القول بخلق القرآن تلك الفتنة الكبرى التي امتحن بسببها أئمة أعلام على رأسهم الإمام الرَّباني والصديق الثاني أحمد بن الحنبل رحمه الله.

وراجع نقدمة الشيخ عبدالقادر الأرناؤوط في تعليقه على لمعة الإعتقاد حيث نبه علة هذا التصويب أيظا بإشارة لطيفة.

بێگومـان ئـادرەمی لـەسەرچـەند قۆناغێـك گفتوگۆکـەی دامەزرانـدووە تابـەهۆی هەریەکێك لەم قۆناغانـەوە پەنـدی لێوەربگرێـت بـۆ قۆناغەکـەی تـر تـا دوژمنەکـەی بشکێنێت.

**قۆناغی یەکەم:**: زانست بێگومان ئادرەمی پرسیاری لێکرد و پێی ووت ئایە پێغەمبـەر صلی الله علیه وعلی آله وسـلم و جێنشینەکانی ڕەزای خوایان لێ بێـت ئـەم بیدعەیـەیان دەزانی؟ بیدعەچـیەکە وتـی :نـەخێر نـەیان دەزانـی جـا ئـەم نەفیکردنـەی بیدعەچـیەکە کەمکردنەوەی نرخی پێغەمبەر صلی الله علیه وعلـی آلـه وسـلم و جێـنشینەکانی ڕەزای خوایان لێ بێت دەگرێتە خۆ بەجۆرێك کەئەوان نەزان بوون بەوەی کە لەشتە گرنگەکان بووە لـە دیندا وەلـەگەڵ ئەوەشدا ئەوە بەڵگەیە لـەسەر بیدعەچـیەکە باشـە ئەگـەر ئـەوان نایزانن، وەئالـەمەوە ئادرەمی گفتوگۆکەی گواستەوە بۆ.

**قۆناغی دووەم:**: باشە ئەگەر ئەوان ئەو شتە نازانن ئەی چۆنە کە تۆ دەیزانیـت؟ ئایـە دەکرێت خـوای گـەورە زانـستێك لـە پێغەمبـەر صـلی الله علیـه وعلـی آلـه وسـلم و جێـنشینەکانی ڕەزای خوایـان لێ بێـت قدەغـەبکات بیـزانن لەشـتێکدا کەپەیوەنـدی بەشەریعەتەوە هەبیت و دەرگای زانینی لەسەرتۆ کردووەتەوە تابیزانیت؟

جابۆیە کابرای بیدعەچی چوە وە بەخۆیدا وتی من دەڵـێم زانیویانـە، بـەو وەڵامـەی بیدعەچیەکە ڕۆیشتە قۆناغێکی تر :

**قۆناغی سێهەم:** ئەگەر ئەوان بێگومـان زانیبێتیـان ئایـە توانیـان بـەو شـێوەیە قـسەی لـەبارەوە نەکەن وە خەڵکیشی بۆلا بانگ نەکەن یـان نـەیان تـوانی؟ کـابرای بیدعەچـی وەڵامی دایەو وتی بەڵێ توانیان بێ دەنگ بن قسەی لەبارەوە نەکەن پاشان موحەمـەدی کوڕی عبدالرحمانی ئەدرەمی پێی وت : شتێك کە پێغەمبـەر صـلی الله علیـه وعلـی آلـه وسلم و جێنشینەکانی ڕەزای خوایان لێ بێت توانیبێتیان بیکەین و نەیانکردبێت ئایە تۆش

ناتوانی نەیکەیت، کابراکە بێ دەنگ بوو هیچ وەڵامی نەدایەوە لەبەرئەوەی دەرگای لەبەردەمدا داخست.

دوای ئەنجامدانی ئەم گفتوگۆیە خەلیفە بۆچوونەکەی ئەدرەمی بەڕاست زانی و بانگەوازی کرد بوارلەبەردەم ئەو کەسانەدا تەسك بکەنەوە ڕازی نەبێت بەوەی پێغەمبەر صلی الله علیه وعلی آلە وسلم و جێنشینەکانی ڕەزای خوایان لێ بێت کردوویانەو هەربیانەوێت بەبۆچوونی خۆیان هەرچیەکیان بووێت بیکەن و بیڵێن، ﴿بەڵکو دەبێت وەك ئەوان بکات لەکوێکدا پێویست بوو قسەبکەن بیکەن و لەکوێشدا پێویست بوو قسەنەکەن نەیکەن چونکە ئەوە زانستی تەواوە کە هەرکەسێك سنوری خۆی بزانێت و دەست درێژی نەکاتە سەر سنورەکانی شەرعەکەی خوای گەورە-وەرگێڕ﴾.

وەهەربەوشێوەیە خاوەنی هەمووبەتاڵێك لە ئانجامدانی بیدعەدا یان هەرشتێکەتر ئەوا هەردەبێت سەرئەنجامی دابڕان بێت لەوەی بتوانێت وەڵام بداتەوە[1].

---

[1] زانای پایە بەرز ڕەحمەتی خوای لێ بێت کەدەفەرمووێت ﴿ شارەزایم لەسەر ژیانی ئادرەمی و ئەو کەسەیشی لەگەڵیدا بووە نیە وەهەروەها نازانم جۆری ئەو بیعدەیەی باسکراوە چی بووە ﴾ بەڵگە نیە لەسەر نەوەی هەرنەزانرێت ئەو نەزانراوانەی لای ئەو زاناپایە بەرزە چین بەڵکو زانایانی تر بەم شێوەیە بۆیان باسکردووین:

- ئەدرەمی : ﴿ ناوی أبو عبدالرحمن بن محمد بن إسحاق الآذرمي ﴾بوە.
- ئەو کەسەیشی گفتوگۆکەی لەگەڵدا ئەنجامداوە ناوی ﴿ ئەحمەدی کوڕی ئەبی داوود بووە دوژمنی سەرسەختی ئیمام ئەحمەد بووە لەسەر ڕێچکەی جەهمیەکان بووە ﴾ ناو و نازناوی بەم شێوەیە بووە ﴿القاضي الكبير أبو عبدالله أحمد بن فرج بن حريز بن الإيادي البصۆي البغدادي الجهمي ﴾ بووە.
- ئەو خەلیفەیەشی لەوشوێنەدا ئامادەبووە ناوی ﴿ الواثق بالله هارون کوری محمد المعتصم بالله کوری هارونە ڕەشید ی عەباسی بووە ﴾.
- ئەو بیدعەیەشی گفتوگۆکەیان لەسەر ئەنجامداوە بیدعەی دروستکردنی قورئان بووە. کەلەو سەردەمەدا باو بووە و خەڵکانێکی زۆر بەهۆیەوە تووشی نارەحەتی و کوشتن و گرتن بوون- وەرگیراوە لەقسەکانی لێکۆڵەرەوە - وەرگێڕ ﴾

باسكردنی هەندێك لەئایەتەكانی سیفەتەكانی خوای گەورە

لەو ئایەتانەی هاتووە لەبارەی سیفەتەكانی خوای گەورەوە :

## ﴿ سیفەتی ڕوو ﴾

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ﴾ الرحمن: ٢٧ واتە ﴿بەتەنها ڕووی پەروەردگارت دەمێنێتەوە﴾.

ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

لەو سیفەتانەی كە دانەر باسی كردووە لە سیفەتەكانی خوای گەورە :

دانەر ڕەحمەتی خوای لێ بێت ئەمانەی لەسیفەتەكانی خوای گەورە باسكردووە و ئێمەش قسەی لەسەر دەكەین بەگوێرەی ڕیزبەندی دانەر:

- **سیفەتی یەكەم :﴿ الوجه – ڕوو ﴾**

ڕوویەكی دانپێدانراو بۆخوای گەورە بە بەڵگەی قورئان و سوننەت و یەكدەنگی پێشین ﴿ سەلەف ﴾.

خوای پەروەردگار دەفەرمووێت : ﴿وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ ﴿٢٧﴾﴾ الرحمن: ٢٧واتە ﴿ تەنها ڕووی پەروەردگاری خاوەن شكۆو كەرەمكەرت دەمێنێتەوە ﴾

وەهەروەها پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم بەسەعدی کوڕی ئەبی وەقاصی فەرموو : ﴿إِنَّكَ لَنْ تُنْفِقَ نَفَقَةً تَبْتَغِي بِهَا وَجْهَ اللَّهِ إِلَّا أُجِرْتَ عَلَيْهَا ﴾[1] متفق عليه. واتە ﴿ ئەی سەعد تۆ هیچ شتێك نابەخیشت مەبەستت پێی ڕووی خوا بێت ئەوا بەدڵنیاییەوە پاداشت دەدرێیتەوە لەسەری ﴾.

وە یەکدەنگی سەلەف لەسەر ئەوەیە دانبنرێت بەوەدا خوای گەورە ڕووی هەیە هەربۆیە پێویستە جێگیرکردنی ڕوو بۆ خوا بەبێ گۆڕین و وەبەبێ پەکخستن وەبەبێ چۆنیەتی بۆدانان وەبەبێ هاوشێوە بۆدانان کەئەوەش بریتیە لە ڕوویەکی ڕاستەقینەی خوای گەورە کە شایستەی خۆیەتی.

وە بەدڵنیاییەوە ئەوانەی سیفەتەکانی خوای گەورە پەکدەخەن سیفەتی ڕووی خوای گەورەیان بە پاداشتی خوا لێکداوەتەوە و ئێمەش بەرپەرچیان دەدەینەوە بەوەی لەپێشەوە لەبنەمای چوارەمدا باسکرا.

---

[1] البخاري : كتاب الجنائز : باب رثاء النبي صلى الله عليه وعلى آله وسلم سعد بن خولة (١٢٩٥).

ومسلم : كتاب الوصية : باب الوصية بثلث ( ١٦٢٨ ) (٥).

# ﴿ سیفەتی دوو دەست ﴾

وەهەروەها خوای گەورە دەفەرمووێت : ﴿بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ﴾ المائدة: ٦٤

ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

## • سیفەتی دووەم : ﴿الیدان – هەردوو دەستی خوای گەورە﴾

دوو دەست لە سیفەتەجێگیرەکانی خوای پەروەردگارە بە بەڵگەی قورئان و سوننەت و یەکدەنگی پێشین ﴿ سەلەف ﴾.

خوای گەورە دەفەرمووێت : ﴿بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ﴾ المائدة: ٦٤ واتە ﴿ بەڵکو هەردوو دەستی خوای گەورە کراوەیە ﴾.

وەهەروەها پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرمووێت : ﴿يَمِينَ اللَّهِ مَلْأَى لَا يَغِيضُهَا نَفَقَةٌ سَحَّاءُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ﴾ تا ئەو شوێنەی کەدەفەرمووێت:﴿ وَبِيَدِهِ الْأُخْرَى الْقَبْضُ يَرْفَعُ وَيَخْفِضُ﴾[1]

---

[1] مسلم : كتاب الزكاة : باب الحث على النفقة وتبشير المنفق بالخلف ( ٩٩٣ ) (٣٧).

وأما رواية البخاري فعنده في كتاب التوحيد : باب قول الله تعالى ﴿لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ﴾ ص: ٧٥ ( ٧٤١١ ) بلفظ (يَد اللَّهِ مَلْأَى لَا يَغِيضُهَا نَفَقَةٌ ..........) من حديث ابي هريرة

لايغيضها : بالعين المعجمة والضاد المعجمة الساقطة : واتە : لێی کەم نابێتەوە .

سحاء : بمهلتين مثقلا ممدود : بەبەردەوامی دەیڕێژی بەسەریدا(١٣ / ٣٩٥ ).

• سوودێك : ئیبن و حەجەر لە فتح الباریدا ( ١٣ / ٣٩٥ ) دەفەرمووێت لەقسەکردن لەسەر دەربڕینەکەی مسلم و گێڕانەوەکەی کەتیایدا لە باتی﴿ يد الله ﴾ ﴿ يمين الله ﴾ هاتووە .

وەدەیکاتە بەڵگە دژی ئەو کەسانەی کە دەستیان لێرەدا بە نیعمەت تەفسیر کردووە وە لەوەش دوورتر ئەو کەسانەی بە گەنجینەکانی خوا تەفسیری کردووە، وەفەرموویەتی ﴿ أطلق اليد على الخزائن لتصرفها فيها ﴾ منیش ووتم ﴿ لێکۆڵەر ﴾: (( لەوەدا بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە : ئیبن و حەجەر ڕەدی ئەوانەی داوەتەوە سیفەتەکانی خوای گەورە دەگۆڕن )).

واتە ﴿ **دەستی خوای گەورە** پڕە بەبەخشین لێی کەم نابێتەوە بەشەو ڕۆژ لێی دەڕێژێت و دەبەخشێت ﴾ ﴿ وەلە دەستەکەی تریدا کێشانەو پێوانە هەیە، بەرزی دەکاتەوە و نزمی دەکاتەوە ﴾[١] هەردوو پێشەوا موسلم و بوخاری ڕیوایەتیانکردووە .

وە سەلەف یەکدەنگن لەسەر جێگیرکردنی دوو دەست بۆ خوای گەورە هەربۆیە پێویستە جێگیرکردنی دوودەست بۆ خوا بەبێ گۆڕین و وەبەبێ پەکخستن وەبەبێ چۆنیەتی بۆدانان وەبەبێ هاوشێوە بۆدانان کەئەوانیش بریتین لە دوو دەستی ڕاستەقینە بۆ خوای گەورە کە شایستەی خۆیەتی.

وە بەدڵنیاییەوە ئەوانەی سیفەتەکانی خوای گەورە پەکدەخەن سیفەتی دوودەستیان بە نیعمەت یان توانایی یان هاوشێوەی ئەوانە ﴾ تەفسیر کردووە ولێکداوەتەوە و ئێمەش بەرپەرچیان دەدەینەوە بەوەی لەپێشەوە لەبنەمای چوارەمدا باسکرا وە بە لایەنێکی چوارەم بەهەمان شێوە بەرپەرچیان دەدەینەوە : لەناو ئایەتەکەدا ئەوەی تێدایە کە ڕێگرە لەوەی بەهیچ جۆرێ بەو شێوەیە تەفسیر بکرێت هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت :

﴿لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ ﴾ص: ٧٥واتە ﴿ بۆ ئەوەی کە بەدوودەستەی خۆم دروستم کردووە ﴾، وەهەروەها فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آلە وسلم دەفەرموێت ﴿وَبِيَدِهِ الْأُخْرَى الْقَبْضُ﴾ واتە ﴿ وەلە دەستەکەی تریدا کێشانەو پێوانە هەیە ﴾.

---

[١] تەواوی فەرموودەکە بەم شێوەیە تەنها بۆ زانیاری هێناومە تا ئاگادار بیت ﴿يَمِينَ اللّٰهِ مَلْأَى لَا يَغِيضُهَا نَفَقَةٌ سَحَّاءُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ أَرَأَيْتُمْ مَا أَنْفَقَ مُنْذُ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ فَإِنَّهُ لَمْ يَنْقُصْ مَا فِي يَمِينِهِ وَعَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ وَبِيَدِهِ الْأُخْرَى الْفَيْضُ أَوْ الْقَبْضُ يَرْفَعُ وَيَخْفِضُ﴾ ﴿ وەرگێڕ ﴾.

ئەو ڕووانەی کە سیفەتی دوو دەستەکەی خوای لەسەر هاتووە و چۆن بتوانین نێوانیان ڕێکبخەین:

• بەشێوەی تاك هاتووە هەروەکو خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلۡمُلۡكُ﴾ الملك: ١ واتە ﴿ پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە دەستەڵاتی هەموو بوونەوەری بەدەستە ﴾.

بەشێوەی جووت هاتووە هەروەکو خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿بَلۡ يَدَاهُ مَبۡسُوطَتَانِ﴾ المائدة: ٦٤ واتە ﴿ بەڵکو هەردوو دەستی خوای گەورە کراوەیە ﴾.

• بەشێوەی کۆ هاتووە هەروەکو خوای گەورە دەفەرموویت :﴿أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّا خَلَقۡنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتۡ أَيۡدِينَآ أَنۡعَٰمٗا فَهُمۡ لَهَا مَٰلِكُونَ ﴿٧١﴾﴾ يس: ٧١

واتە ﴿ ئایە ئەو بێباوەڕو بتپەرستانە نابینن کە چۆن ئێمە ئاژەڵمان بە دەستەکانمان بۆ دروست کردوون لە ووشترو مەڕ و بزن و مانگا﴾ .

وە ڕێکخستن لە نێوان ئەم ڕووە جیاوازانەدا بە جۆرێك دەبێت کە بڵێین :

ڕووی یەکەم : ﴿ مفرد مضاف ﴾ە ﴿ تاکەو دراوەتە پاڵ ئەوەی لەگەڵیدایە واتە : دراوەتە پاڵ (( هاء الضمير )) کەدەگەڕێتەوە بۆ لای زاتی الله ﴾ جالەم بارەدا هەموو ئەوانەی جێگیربووە بۆ خوای گەورە لە دەست دەگرێتە خۆ، وەڕێگریش نیە لەوەی بۆ ﴿جووت﴾ بێت[1]، وەهەرچی دەربارەی ﴿کۆ﴾ یە ئەوا بۆ بەگەورەدانان بەکاردەهێنرێت نەك لەبەر خودی ژمارەکە کەئەویش سێیە یان زۆرتر، و لەوکاتەشدا ﴿جووت﴾یش دەگرێتە خۆ چونکە ووتراوە کەمترین ڕێژەی ﴿کۆ﴾ دووانە، جائەگەر ﴿کۆ﴾ەکە دانرا بەوەی کەمترین ڕێژەی ﴿کۆ﴾ دووانە ئەوا هیچ جۆرە دژایەتیەك لەنێوان ﴿کۆ﴾ و نێوان ﴿جووت- دووان﴾دا هەر لەبنەڕەتدا نیە.

---

[1] واتە لەم وشەی ﴿ بیده ﴾ کە ﴿ ید ﴾ بەتاك هاتووە هیچ ڕێگری و مەنعێکی تیا نیە کە بۆ دوو دەستی خوا بەکاربهێنرێت – م. عبدالرحمن .

# ﴿ سیفەتی نەفس ﴾

وەهەروەها خوای گەورە هەواڵ لەبارەی پێغەمبەر عیساوە h دەدات کە فەرموویەتی: ﴿تَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِي وَلَآ أَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِكَ﴾ المائدة: ١١٦ واتە: ﴿خوای گەورە تۆ دەزانیت چی لە ناخ و دەروونی مندا هەیە بەڵام من نازانم چی لە نەفسی تۆدا هەیە﴾.

ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

- **سیفەتی سێهەم:** ﴿النفس – نەفسی خوای گەورە﴾

داننان بە نەفسێکی جێگیر بۆ خوای گەورە بە بەڵگەی قورئان و سوننەت و یەکدەنگی پێشین ﴿ سەلەف ﴾.

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿كَتَبَ رَبُّكُمۡ عَلَىٰ نَفۡسِهِ ٱلرَّحۡمَةَ﴾ الأنعام: ٥٤

واتە : ﴿ دڵنیا بن خوای پەروەردگارتان لەسەر نەفسی خۆی نووسیوە بەبەزەیی و بەرِحم بێت لەگەڵتاندا ﴾.

وەهەروەها خوای گەورە هەواڵ لەبارەی پێغەمبەر عیساوە h دەدات کە فەرموویەتی: ﴿تَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِي وَلَآ أَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِكَ﴾ المائدة: ١١٦ واتە: ﴿ خوای گەورە تۆ دەزانیت چی لە ناخ و دەروونی مندا هەیە بەڵام من نازانم چی لە نەفسی تۆدا هەیە﴾.

وەهـەروەها پێغەمبـەری خـواوە صـلی الله علیـه وعلـی آلـه وسـلم دەفـەرمووێت : ﴿سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ عَدَدَ خَلْقِهِ وَرِضَاءَ نَفْسِهِ وَزِنَةَ عَرْشِهِ وَمِدَادَ كَلِمَاتِهِ ﴾[1] واتـه ﴿پاكی و بێ كەم و كورتی و گەورەیی سپاس بـۆ خـوای گـەورە بەئەنـدازەی ژمـارەی دروستكراوەكانی و ڕەزای خۆی و قورسایی عەرشەكەیی و زۆرو درێژی وشەكانی﴾

وە سەلەف لەسەر دانپێـدانانی و جێگیركردنـی یەكـدنگن بـەو شـێوەیەی شایـستەو شیاوی خۆیەتی هەربۆیە پێویـستە دانپێـدانان و جێگیركردنـی سـیفەتی ﴿ نـەفس ﴾ بـۆ خوای گەورە بەبێ گۆڕین و وەبەبێ پەكخستن وەبەبێ چۆنیەتی بۆدانان وەبەبێ هاوشێوە بۆدانان.

---

١ مسلم : كتاب الذكر والدعاء .. : باب التسبيح أول النهار وعند النوم ( ٢٧٢٦ )(٧٩) من حديث جويرية رضي الله عنها.

# ﴿ سیفەتی هاتن ﴾

⇦ وە خوای پاك و بێگەرد دەفەرموویت :﴿ وَجَآءَ رَبُّكَ ﴾ الفجر: ٢٢

واتە ﴿ وەلەو ڕۆژەدا پەروەردگارت هات بەهاتنێك شیاوی خۆی بێت ﴾

وەهەروەها دەفەرموویت : ﴿ هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأۡتِيَهُمُ ٱللَّهُ ﴾ البقرة: ٢١٠

واتە ﴿ ئایە ئەوانەی پەیڕەوانی شەیتانن چاوەڕێی چی دەکەن بەدەر لەوەی خوای گەورە بێت بۆ لایان ﴾.

ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

## • سیفەتی چوارەم :﴿ المجيء – هاتنی خوای پەروەردگار ﴾

هاتنی خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا بۆ حوکومکردن لە نێوان بەندەکانیدا جێگیربووە بە بەڵگەی قورئان و سوننەت و یەکدەنگی پێشین ﴿ سەلەف ﴾.

وە خوای پاك و بێگەرد دەفەرموویت :﴿ وَجَآءَ رَبُّكَ ﴾ الفجر: ٢٢

واتە ﴿ وەلەو ڕۆژەدا پەروەردگارت هات بەهاتنێك شیاوی خۆی بێت ﴾

وەهەروەها دەفەرموویت : ﴿ هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأۡتِيَهُمُ ٱللَّهُ ﴾ البقرة: ٢١٠

واتە ﴿ ئایە ئەوانەی پەیڕەوانی شەیتانن چاوەڕێی چی دەکەن بەدەر لەوەی خوای گەورە بێت بۆ لایان ﴾.

وەهەروەها پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفـەرمووێت : ﴿حَتَّى إِذَا لَمْ يَبْقَ إِلَّا مَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللَّهَ أَتَاهُمْ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾[1] متفق عليه .

واته :﴿ تائەو کاتەی ئەگەر نەمایەوە جگـە لەکەسـانێك نـەبێت کـە خـوای گـەورە دەپەرستن پەروەردگاری جیهانیان دێت بۆ لایان ﴾[2] لەفەرموودەیەکی درێژدا .

---

١ البخاري : كتاب التوحيد : باب قول الله تعالى :﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ۝٢٢ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ۝٢٣ ﴾ القيامة: ٢٢ – ٢٣(٧٤٣٩).

ومسلم : كتاب الإيمان : باب معرفة طريق الرؤية ( ١٨٣ ) ( ٣٠٢ ) من حديث أبي سعيد الخدري رضي الله عنه.

٢ موسڵمانانی ئازیز ئەم فەرموودەیەی زانای پایەبەرز لەڕاڤەکەدا هێناویەتی بەشێکە لە فەرموودەیەکی درێژ کـە تیایـدا نەتەوەکانی تێدا حەشردەکرێت و باسی هاتنی خوای پەروەردگاریشی تێدایە کە دێت بۆلای کەسانێك تـەنها خوایـان پەرستووە چاوەڕێی هاتنی دەکەن، جالەبەر گرنگی ئەو فەرموودەیە کە پێشەوا بوخاری لە صـەحیحەکەیدا هێناویـەتی منیش لێرەدا بە پێویستی دەزانم بیهێنم لەبەر دوو هۆ :

١- وەك ڕەدێك بۆ بیدعەچیەکان کەبەئارەزووی خۆیان هەرچیەکیان بوێـت دەیگـۆڕن لـەوانـەش سـیفەتەکانی پەروەردگار چونکە ئەم فەرموودەیە بیانوویان دەبڕێت، بەڵام ئەوەی جێگەی پرسـیارە ئەوەیـە ئایـە ئەوانـە دەگەڕێنەوە بۆ هەق ؟ وەڵامەکەی بۆ تۆی خوێنەر جێدەهێڵم.

٢- وەك موژدەیەك بۆ خواپەرسـتان کـەهیچ خەفـەت نـەخۆن ژیـانی دونیـا هـیچ نیـە پاشـان مـردن دێـت و زیندودەکرێینەوە و خوای گەورە دێت بۆلایان وە دەیبینین، داواکارم خوای گـەورە مـن و تـۆش بگێـڕێ لەوانەی ئەو موژدەیە دەیانگرێتەوە.

فەرموودەکە:

٤٥٨١ – حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ حَدَّثَنَا أَبُو عُمَرَ حَفْصُ بْنُ مَيْسَرَةَ عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ﴿ أَنَّ أُنَاسًا فِي زَمَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلْ نَرَى رَبَّنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَعَمْ هَلْ تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ الشَّمْسِ بِالظَّهِيرَةِ ضَوْءٌ لَيْسَ فِيهَا سَحَابٌ قَالُوا لَا قَالَ وَهَلْ تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ ضَوْءٌ لَيْسَ فِيهَا سَحَابٌ قَالُوا لَا قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِلَّا كَمَا تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ أَحَدِهِمَا إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ أَذَّنَ مُؤَذِّنٌ تَتْبَعُ كُلُّ أُمَّةٍ مَا كَانَتْ تَعْبُدُ فَلَا يَبْقَى مَنْ كَانَ يَعْبُدُ غَيْرَ اللَّهِ مِنْ الْأَصْنَامِ وَالْأَنْصَابِ إِلَّا يَتَسَاقَطُونَ فِي النَّارِ حَتَّى إِذَا لَمْ يَبْقَ إِلَّا مَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللَّهَ بَرٌّ أَوْ فَاجِرٌ وَغُبَّرَاتُ أَهْلِ الْكِتَابِ فَيُدْعَى الْيَهُودُ فَيُقَالُ لَهُمْ مَنْ كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ قَالُوا كُنَّا نَعْبُدُ عُزَيْرَ ابْنَ اللَّهِ فَيُقَالُ لَهُمْ كَذَبْتُمْ مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِنْ صَاحِبَةٍ وَلَا وَلَدٍ فَمَاذَا تَبْغُونَ فَقَالُوا عَطِشْنَا رَبَّنَا فَاسْقِنَا فَيُشَارُ أَلَا تَرِدُونَ فَيُحْشَرُونَ إِلَى النَّارِ كَأَنَّهَا سَرَابٌ يَحْطِمُ بَعْضُهَا بَعْضًا فَيَتَسَاقَطُونَ فِي النَّارِ ثُمَّ يُدْعَى النَّصَارَى فَيُقَالُ لَهُمْ مَنْ كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ قَالُوا كُنَّا نَعْبُدُ الْمَسِيحَ ابْنَ اللَّهِ فَيُقَالُ لَهُمْ كَذَبْتُمْ مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِنْ صَاحِبَةٍ وَلَا وَلَدٍ فَيُقَالُ لَهُمْ مَاذَا تَبْغُونَ فَكَذَلِكَ مِثْلَ الْأَوَّلِ حَتَّى إِذَا لَمْ يَبْقَ إِلَّا مَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللَّهَ مِنْ بر أَوْ فَاجِرٍ أَتَاهُمْ رَبُّ الْعَالَمِينَ فِي أَدْنَى صُورَةٍ مِنْ الَّتِي رَأَوْهُ فِيهَا فَيُقَالُ مَاذَا تَنْتَظِرُونَ تَتْبَعُ كُلُّ أُمَّةٍ مَا كَانَتْ تَعْبُدُ قَالُوا فَارَقْنَا النَّاسَ فِي الدُّنْيَا عَلَى أَفْقَرِ مَا كُنَّا إِلَيْهِمْ وَلَمْ نُصَاحِبْهُمْ وَنَحْنُ نَنْتَظِرُ رَبَّنَا الَّذِي كُنَّا نَعْبُدُ فَيَقُولُ أَنَا رَبُّكُمْ فَيَقُولُونَ لَا نُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا ﴾ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا.–وەرگێڕ

وە سەلەف یەکدەنگن لەسەر چەسپاندنی سیفەتی ﴿ هاتنن ﴾ بۆ خوای گەورە

هەربۆیە پێویستە جێگیرکردنی ﴿ هاتن ﴾ بۆ خوا بەبێ گۆڕین و وەبەبێ پەکخستن وەبەبێ چۆنیەتی بۆدانان وەبەبێ هاوشێوە بۆدانان کەئەویش بریتیە لە هاتنێکی ڕاستەقینە بۆ خوای گەورە کە شایستەی خۆیەتی .

وە بەدڵنیاییەوە ئەوانەی سیفەتەکانی خوای گەورە پەکدەخەن سیفەتی هاتنی خوای گەورەیان بە هاتنی فەرمانەکەی خوا لێکداوەتەوە و ئێمەش بەرپەرچیان دەدەینەوە بەوەی لەپێشەوە لەبنەمای چوارەمدا باسکرا.

## ﴿ سیفەتی ڕازیبوون ﴾

وەهەروەها خوای گەورە دەفەرموویّت : ﴿رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ﴾ المائدة: ١١٩

واتە ﴿ خوای پەروەردگار لەوان ڕازییەو ئەوانیش لە خوای پەروەردگار ڕازین ﴾

ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

## • سیفەتی پێنجەم: ﴿ الرِّضى– سیفەتی ڕازیبوونی خوای گەورە ﴾

ڕازیبوون یەکێکە لە سیفەتە چەسپاوەکانی خوای گەورە بە بەڵگەی قورئان و سوننەت و یەکدەنگی پێشین ﴿ سەلەف ﴾.

خوای گەورە دەفەرموویّت : ﴿رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ﴾ المائدة: ١١٩

واتە ﴿ خوای پەروەردگار لەوان ڕازییەو ئەوانیش لە خوای پەروەردگار ڕازین ﴾.

وەهەروەها پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرموویّت : ﴿إِنَّ اللَّـهَ لَيَرْضَى عَنِ الْعَبْدِ أَنْ يَأْكُلَ الأَكْلَةَ فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا أَوْ يَشْرَبَ الشَّرْبَةَ فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا ﴾[1]

واتە ﴿ خوای پەروەردگار ڕازی دەبێت لەبەندەیەك كە هەرجارێك خواردنێك دەخوات سوپاسی دەكات لەسەر ئەو خواردنەی بەوی بەخشیوە، یان لەكاتێكدا تینوی دەبێت و ئاو دەخواتەوە سوپاسی دەكات لەسەر ئەو خواردنەوەیەی بەوی بەخشیوە ﴾.

---

[1] مسلم : كتاب الذكر والدعاء : باب إستحباب حمد الله تعالى بعد الأكل والشرب ( ٢٧٣٤ ) (٧٩ ) من حديث أنس بن مالك رضي الله عنه .

الأكلة:بریتیە لەخواردنی ژەمێك لە خواردن وەك نیوەڕو ئێوارە.

هەربۆیە پێویستە جێگیرکردنی سیفەتی ﴿ ڕازیبوون ﴾ بۆ خوای گەورە بەبێ گۆڕین و وەبەبێ پەکخستن وەبەبێ چۆنیەتی بۆدانان وەبەبێ هاوشێوە بۆدانان کەئەویش بریتیە لە ڕازیبوونێکی ڕاستەقینە بۆ خوای گەورە کە شایستەی خۆیەتی .

وە بەدڵنیاییەوە ئەوانەی سیفەتەکانی خوای گەورە پەکدەخەن سیفەتی ڕازیبوونی خوای گەورەیان بە پاداشتی خوا لێکداوەتەوە و ئێمەش بەرپەرچیان دەدەینەوە بەوەی لەپێشەوە لەبنەمای چوارەمدا باسکرا.

# ﴿ سیفەتی خۆشەویستی ﴾

وەهەروەها خوای گەورە دەفەرموویت :﴿ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ ﴾ المائدة: ٥٤

واتە ﴿ خۆشی دەوێن و ئەوانیش ئەویان خۆش دەوێت ﴾.

ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

## • سیفەتی شەشەم: ﴿ المحّبة – خۆشەویستی﴾

خۆشەویستی یەکێکە لە سیفەتە چەسپاوەکانی خوای گەورە بە بەڵگەی قورئان و سوننەت و یەکدەنگی پێشین ﴿ سەلەف ﴾.

خوای گەورە دەفەرموویت :﴿ فَسَوْفَ يَأْتِي ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ ﴾ المائدة: ٥٤

واتە ﴿ جاخوای گەورە لەمەدوا کەسانێك دێنێت کە خۆشی دەوێن و ئەوانیش ئەویان خۆش دەوێت ﴾.

وەهەروەها پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم لە ڕۆژی خەیبەردا بە پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێت فەرموو: ﴿لأُعْطِيَنَّ الرَّايَةَ غَدًا رَجُلاً يُحِبُّ اللّٰهَ وَرَسُولَهُ وْ يُحِبُّهُ اللّٰهُ وَرَسُولُهُ ﴾[1] واتە ﴿ بەیانی ئاڵاکە دەدەم بە پیاوێك کە خواو پێغەمبەرەکەی صلى الله عليه وعلى آله وسلم خۆش دەوێت وە خواو پێغەمبەرەکەیشی صلى الله عليه وعلى آله وسلم ئەویان خۆش دەوێت ﴾.

---

[1] البخاري : كتاب المغازي : باب غزوة الخيبر ( ٤٢١٠ ).

ومسلم : كتاب فضائل الصحابة : باب من فضائل علي ( ٢٤٠٦ ) ( ٣٤ ) من حديث سهل بن سعد رضي الله عنه.

ئەو پیاوەی لەفەرموودەکەدا ناوی براوە ﴿عەلی کوڕی ئەبو تالیب ڕەزای خوای لێ بێت ﴾بوو.

سەلەف یەکدەنگن لەسەر چەسپاندنی سیفەتی ﴿ خۆشەویستی ﴾ بۆ خوای گـەورە بەجۆری کە خۆشەویستی هەیە و خۆشەویستیشە هەربۆیە پێویستە جێگیرکردنی سـیفەتی ﴿ خۆشەویستی ﴾ بۆ خوای گەورە بەبێ گۆڕین و وەبەبێ پەکخستن وەبەبێ چـۆنیەتی بۆدانان وەبەبێ هاوشێوە بۆدانان کەئـەویش بریتیـە لـە خۆشەویـستیەکی ڕاسـتەقینە بـۆ خوای گەورە کە شایستەی خۆیەتی .

وە بەدڵنیاییەوە ئەوانەی سیفەتەکانی خـوای گـەورە پەکدەخـەن سـیفەتی ڕازیبـوونی خوای گەورەیان بە پاداشتی خوا لێکداوەتەوە و ئێمەش بەرپەرچـیان دەدەینـەوە بـەوەی لەپێشەوە لەبنەمای چوارەمدا باسکرا.

# ﴿ سیفەتی توڕەبوون ﴾

وەهەروەها خوای گەورە دەفەرمووێت :﴿ وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ ﴾ الفتح: ٦

واتە ﴿ وە تووڕەیە لێیان ﴾.

ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

## • سیفەتی حەوتەم: ﴿ الغضب – تووڕەبوون ﴾

توڕەبوون یەکێکە لە سیفەتە چەسپاوەکانی خوای گەورە بە بەڵگەی قورئان و سوننەت و یەکدەنگی پێشین ﴿ سەلەف ﴾.

خوای گەورە لەبارەی کەسێکەوە باوەڕدارێک بەدەستی ئەنقەست بکوژێت دەفەرموێت: ﴿ وَمَن يَقۡتُلۡ مُؤۡمِنٗا مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدٗا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمٗا ٩٣ ﴾ النساء: ٩٣

واتە ﴿ هەرکەسێك بەدەستی ئەنقەست مرۆڤێکی خاوەن باوەڕ بکوژێت سزاو تۆڵەی هەردۆزەخەو بەهەتاهەتایش تێیدا دەمێنێتەوە غەزەب و تووڕەیی خوای لەسەرەو نەفرینیشی لێکردووە ﴾.

وەهەروەها پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرموێت : ﴿إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ كِتَابًا قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ الْخَلْقَ إِنَّ رَحْمَتِي سَبَقَتْ غَضَبِي فَهُوَ مَكْتُوبٌ عِنْدَهُ فَوْقَ الْعَرْشِ﴾[1]

---

[1] البخاري : كتاب التوحيد : باب قول الله تعالى ﴿ بَلۡ هُوَ قُرۡءَانٞ مَّجِيدٞ ٢١ فِي لَوۡحٖ مَّحۡفُوظِۭ ٢٢ ﴾ البروج: ٢١ - ٢٢ (٧٥٥٤).

ومسلم : كتاب التوبة : باب في سعة رحمة الله تعالى وأنها سبقت غضبه ( ٢٧٥١ ) ( ١٤ )من حديث أبي هريرة رضي الله عنه.

واتە ﴿ خوای پەروەردگار نووسینێکی نووسی پێش ئەوەی هیچ دروستکراوێك دروست بکات کە بەزەیی من پێش **تووڕەبوونم** کەوتووە کەئەوەش نووسراوە لەلای خۆی لەسەر عەرش ﴾[1]

وە بێگومان سەلەف یەکدەنگن لەسەر چەسپاندنی سیفەتی ﴿ تووڕەبوون ﴾ بۆ خوای گەورە هەربۆیە پێویستە جێگیرکردنی سیفەتی ﴿ تووڕەبوون ﴾ بۆ خوای گەورە بەبێ گۆڕین و وەبەبێ پەکخستن وەبەبێ چۆنیەتی بۆدانان وەبەبێ هاوشێوە بۆدانان کەئەویش بریتیە لە ﴿ تووڕەبوونێکی ﴾ڕاستەقینە بۆ خوای گەورە کە شایستەی خۆیەتی .

وە بەدڵنیاییەوە ئەوانەی سیفەتەکانی خوای گەورە پەکدەخەن سیفەتی تووڕەبوونی خوای گەورەیان بە تۆڵەسەندنەوە لێکداوەتەوە و ئێمەش بەرپەرچیان دەدەینەوە بەوەی لەپێشەوە لەبنەمای چوارەمدا باسکرا، وە لەڕوویەکی ترەوە خوای گەورە جیاوازی کردووە لەنێوان ﴿ توڕبوون و تۆڵەسەندنەوە﴾دا جالەوبارەوە خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا ﴾الزخرف: ٥٥واتە ﴿ جاکتێك توڕیان کردین ﴾

﴿ ٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ ﴾الزخرف: ٥٥واتە ﴿ تۆڵەمان لێسەندنەوە ﴾ خوای گەورە تۆڵەسەندنەوەی کردە دەرئەنجام و ئامانج بۆ توڕبوونەکەی، کەئەوەش بەڵگەیە لەسەرئەوەی کە جیاوازی هەیە لەنێوان ﴿ توڕبوون و تۆڵەسەندنەوە﴾دا.

---

[1] خۆشەویستان زانای ڕاڤەکار دەقی فەرموودەکەی بەجۆرێکی تر هێناوە بەڵام من کەسەیری بوخاریم کرد بینیم بەو شێوەیەی سەرەوە ڕاستە وەهەروەها لە موسلیمیشدا هەربەو شێوەیە نیە بۆیە ئەوەم هەڵبژارد پێم وایە شێخیش ئەوەی لە قەست نەهێناوە. هاتووە فەرموودەکەی لە بوخاری و موسلیمدا هەڵبژاردووە وئەو شێوەیەی لیدەرچووە.
واللە أعلم ﴿وەرگێر﴾

# ﴿ سیفەتی ناڕازی بوون﴾

⟸ وەهەروەها خوای گـەورە دەفـەرموویّت :﴿ ٱتَّبَعُوا۟ مَآ أَسۡخَطَ ٱللَّهَ ﴾ محمد: ٢٨واتە ﴿ شوێنی شتێك كەوتن خوای گەورە ناڕازییە لێی ﴾.

ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

## • سیفەتی هەشتەم: ﴿ السخط – تووڕەیی ﴾

توڕەیی یەكێكـە لــە سـیفەتە چەسـپاوەكانی خـوای گـەورە بـە بەڵگـەی قورئـان و سوننەتو یەكدەنگی پێشین ﴿ سەلەف ﴾.

خوای گەورە دەفەرموویّت :﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱتَّبَعُوا۟ مَآ أَسۡخَطَ ٱللَّهَ ﴾محمد: ٢٨

واتە ﴿ ئەو تۆڵەیەشیان بەو جۆرە بەهۆی ئەوەوەیە كەبەڕاستی شوێنی شتێك كەوتن خوا **توڕە دەكات** ﴾.

وە لـە دوعاو نزاكانی پێغەمبەری خوا صـلی الله علیـە وعلـی آلـە وسـلم ئـەوە بـوو كەدەیفەرموو : ﴿اللَّهُمَّ أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ وَبِمُعَافَاتِكَ مِـنْ عُقُوبَتِـكَ وَأَعُـوذُ بِـكَ مِنْكَ لاَ أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ ﴾[1]

واتە ﴿ خوایە پەنا دەگرم بەڕەزای تۆ لە توڕەبوونت، وەپەنا دەگرم بەلێبوردەیت لــە سزادانت، وەخوای گەورە پەنادەگرم بەتۆ لەخۆت، ستایشم بۆتۆ ژمارەناكەم، هەروەكو چۆن خۆت ستایشی نەفسی خۆتت كردووە ﴾.

---

[1] مسلم : كتاب الصلاة : باب مايقال في الركوع والسجود ( ٤٨٦ ) ( ٢٢٢ )من حديث عائيـشة رضي الله عنها.

وە بێگومان سەلەف یەکدەنگن لەسەر چەسپاندنی سیفەتی ﴿ تورەیی ﴾ بۆ خـوای گەورە هەربۆیە پێویستە جێگیرکردنی سیفەتی ﴿ تورەیی ﴾ بۆ خـوای گـەورە بـەبێ گۆڕین و وەبەبێ پەکخستن وەبەبێ چۆنیەتی بۆدانان وەبەبێ هاوشێوە بۆدانان کەئـەویش بریتیە لە ﴿ تورەییەکی ﴾ڕاستەقینە بۆ خوای گەورە کە شایستەی خۆیەتی .

وە بەدڵنیاییەوە ئەوانەی سیفەتەکانی خوای گەورە پەکدەخەن سیفەتی تورەیی خـوای گـەورەیان بـە تۆڵەسـەندنەوە لێکداوەتـەوە و ئێمـەش بەرپەرچـیان دەدەینـەوە بـەوەی لەپێشەوە لەبنەمای چوارەمدا باسکرا .

# ﴿ سیفەتی پێناخۆشبوون ﴾

وەهەروەها خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمۡ﴾ التوبة: ٤٦ واتە ﴿ خوا هاتنیانی پێخۆش نەبوو ﴾.

ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

- **سیفەتی نۆهەم:** ﴿ الكراهة – پێناخۆش بوون ﴾

پێناخۆشبوون لەخواوە بۆئەو كەسەی شایەنی بێت چەسپاوە بە بەڵگەی قورئان و سوننەت و یەكدەنگی پێشین ﴿ سەلەف ﴾.

خوای گەورە دەفەرموویت :﴿وَلَٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمۡ﴾التوبة: ٤٦

واتە ﴿ بەڵام چونكە خوا هاتنیانی پێخۆش نەبوو ﴾.

وەهەروەها پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وعلی آله وسلم دەفەرموویت : ﴿إِنَّ اللَّهَ كَرِهَ لَكُمْ ثَلاثًا قِيلَ وَقَالَ وَكَثْرَةَ السُّؤَالِ وَإِضَاعَةَ الْمَالِ﴾[1].

واتە ﴿ خوای گەورە سێ شتی بۆ ئێوە پێناخۆشە ئەنجامی بدەن كەئەوانیش : وتی وتی و پرسیارزۆر كردن بێ ئەوەی پێویستیەك هەبێت، وە ماڵ بە فیرۆدان ﴾

وە بێگومان سەلەف یەكدەنگن لەسەر چەسپاندنی سیفەتی ﴿ پێناخۆش بوون ﴾ بۆ خوای گەورە هەربۆیە پێویستە جێگیركردنی سیفەتی ﴿ پێناخۆش بوون ﴾بۆ خوای

[1] البخاري : كتاب الأدب : باب عقوق الوالدين من الكبائر ( ٥٩٧٥ ).

ومسلم : كتاب الأقضية : باب النهي عن كثرة المسائل من غير حاجة ... ( ٥٩٣ ) ( ١٣ ) واللفظ له . من حديث المغيرة بن الشعبة.

گەورە بەبێ گۆڕین و وەبەبێ پەکخستن وەبەبێ چۆنیەتی بۆدانان وەبەبێ هاوشێوە بۆدانان کەئەویش بریتیە لە ﴿ پێناخۆش بوونێکی ﴾ڕاستەقینە بۆ خوای گەورە کە شایستەی خۆیەتی .

وە بەدڵنیاییەوە ئەوانەی سیفەتەکانی خوای گەورە پەکدەخەن سیفەتی ﴿ پێناخۆش بوونی ﴾ خوای گەورەیان بە دوورخستنەوە لێکداوەتەوە و ئێمەش بەرپەرچیان دەدەینەوە بەوەی لەپێشەوە لەبنەمای چوارەمدا باسکرا .

باسکردنی هەندێك لەفەرموودەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم دەربارەی سیفەتەکانی خوای گەورە

## ﴿ سیفەتی دابەزین ﴾

وەلەسوننەتیشدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم دەفەرموویت :﴿ يَنْزِلُ رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا ﴾*

واتە ﴿ پەروەردگارمان پاك و بێگەردی و بەرزی بۆئەو هەموو شەوێك دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا ﴾.

ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

### • سیفەتی دەیەم:﴿ النزول – دابەزینی خوای گەورە ﴾

دابەزینی خوای گەورە بۆ ئاسمانی دونیا لەسیفەتە چەسپاوەکانیەتی بە بەڵگەی سوننەت و یەکدەنگی پێشین ﴿ سەلەف ﴾.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم دەفەرموویت :﴿ يَنْزِلُ رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الْآخِرُ يَقُولُ مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ﴾[1] الحديث متفق عليه.

---

* ئین ولقەیم لە پەرتووکی ﴿ إجتماع الجیوش – لاپەڕە ١٩١ ﴾ ئەوەشی بۆزیادکردووە :
وە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم دەفەرموویت :﴿ لله أفرح بتوبة العبد ﴾.

[1] البخاري: كتاب التوحيد : باب الدعاء والصلاة في آخر الليل ( ١١٤٥ ).
ومسلم : كتاب صلاة المسافرين : باب الترغيب في العاء والذكر في آخر الليل والإجابة فيه (٧٥٨) ( ١٦٨) من حديث أبي هريرة رضي الله عنه .
وفي الباب عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه أخرجه مسلم ( ٧٥٨ ) (١٧٢) .
وراجع لشرح هذا الحديث والكلام عليه باستفاضة (( شرح حديث النزول )) لشيخ الإسلام إبن تيمية رحمه الله.

واتە ﴿ پەروەردگارمان پاك و بێگەردی و بەرزی بۆئەو هەموو شـەوێك دادەبەزێتـە ئاسمانی دونیا لەکاتێکدا سێیەکی کۆتایی شـەو دەمێنێتـەوە جـا دەفـەرمووێت کـێ لـێم دەپاڕێتەوە با وەڵامی بدەمەوە .... ﴾

وە بێگومــان ســەلەف یەکــدەنگن لەســەر چەســپاندنی ســیفەتی ﴿دابــەزین و هاتنەخوارەوە﴾ بۆ خوای گەورە هەربۆیە پێویستە جێگیرکردنـی سیفەتی ﴿دابـەزین و هاتنەخوارەوە﴾ بۆ خوای گەورە بەبێ گـۆڕین و وەبـەبێ پەکخـستن وەبـەبێ چـۆنیەتی بۆدانان وەبەبێ هاوشێوە بۆدانان کەئەویش بریتیە لە ﴿ دابەزین و هاتنەخوارەوەیـەکی﴾ ڕاستەقینە بۆ خوای گەورە کە شایستەی خۆیەتی .

وە بەدڵنیاییەوە ئەوانەی سیفەتەکانی خوای گەورە پەکدەخەن سـیفەتی ﴿ دابـەزین و هاتنــەخوارەوەی﴾خـوای گـەورەیان بـە دابـەزینی فەرمانەکـەی یـان بەزەییەکـەی یـان فریــشتەیەك لــە فریــشتەکانی لێکداوەتـەوە و ئێمــەش بەرپەرچـیان دەدەینــەوە بــەوەی لەپێشەوە لەبنەمای چوارەمدا باسـکرا . وەبەشـێوەیەکی تـریش بەرپەرچـیان دەدەینـەوە بەوەی کە فەرمانکردن و هاوشێوەی ئەوە ناکرێـت و ناگونجێـت کـەبلێت : کـێ لـێم دەپاڕێتەوە با وەڵامی بدەمەوە ....[1] تاکۆتایی.

---

١ ئاماژەیە بەبەشی کۆتایی فەرموودەکە کە دەفەرمووێت : ﴿مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ﴾ واتە : ئەگەر مەبەست لەدابەزین دابـەزینی مەلائیکـە یـان ڕەحمـەتی خـوا یـان فـەرمانی خـوا بێـت بـۆ لـەکۆتای فەرموودەکەدا دەفەرمووێت : کێ بانگم دەکات تاوەڵامی بدەمەوە، کەواتە ﴿ نزول ﴾ دراوەتـە پـاڵ خوای گەورە نەك مەلائیکەو ......... هتد .

## ﴿ سیفەتی سەیرلێهاتن ﴾

وەهەروەها پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرمووێت :

﴿يَعْجَبُ رَبُّكَ مِنَ الشَّابِّ لَيْسَتْ لَهُ صَبْوَة ﴾ واتە ﴿پەروەردگارت **سەیری دێت** لە گەنجێك بەلای ئارەزووبازیدا نەچێت ﴾

ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

- **سیفەتی یانزەهەم: ﴿ العَجَبْ – سەیرلێهاتن ﴾**

سەیرلێهاتن یەکێکە لەسیفەتە چەسپاوەکانی خوای گەورە بە بەڵگەی قورئان و سوننەت و یەکدەنگی پێشین ﴿ سەلەف ﴾.

خوای گەورە دەفەرمووێت : ﴿ بَلْ عَجِبْتَ وَيَسْخَرُونَ ﴿١٢﴾ ﴾ الصافات: ١٢

لەسەر خوێندنەوەی هەریەکە لە ﴿ حمزة، الكسائي، وخلف ﴾ کەئەوان ئەو تائەی لەسەر ﴿عَجِبْتَ ﴾ ەیە بە ﴿ ضَمْ ﴾[1] دەیخوێننەوە، واتە ئابەو شێوەیەی لێدێت ﴿عجبتُ ﴾

واتە ﴿ من سەیرم لێدێت بەڵام ئەوان گاڵتەدەکەن ﴾ بەڵام لەسەر شێوەکەی خۆی واتە ﴿ بەڵکو تۆ لەململانێی ئەوان دەربارەی ئەو هەواڵە یەقینەیەی کەبیستویانە لە قوڕێکی نەرمی پێکەوە نووساو لینج ئادەم دروست بووە سەیرداماوی و ئەوانیش بۆخۆیان هەرخەریکی پێکەنین و گاڵتەو مەسخەرەن بەتۆ و بەزیندوبوونەوە ﴾.

[1] يشير الشيخ رحمه الله إلى قرآءة حمزة والكسائي وخلف بضم التاء . راجع المبسوط في القرآءاة العشر لابن مهران الأصبهاني ص(٣٥٧)، والسبعة في القرآءاة لابن مجاهد ص (٥٤٧ ) .

تێبینی: ئایەتەکە لەسەر خوێندنەوەی ﴿ حمزة، الكسائي، وخلف ﴾ کە﴿ ضَمْ ﴾ە بەکاردەهێنرێت بۆ ئەم سیفەتەی خوای گەورە. ﴿وەرگێڕ﴾.

وەهەروەها پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرمووێت :

﴿يَعْجَبُ رَبُّكَ مِنَ الشَّابِّ لَيْسَتْ لَهُ صَبْوَة ﴾ رواه أحمد وهو في المسند ص ١٥١ج٤ عن عقبة بن عامر مرفوعا وفيه إبن لهيعة[١].

واتە ﴿پەروەردگارت سەیری دێت لە گەنجێك حەزی بەلای ئارەزووبازیدا نەچێت﴾

وە بێگومان سەلەف یەکدەنگن لەسەر چەسپاندنی سیفەتی ﴿ سەیر لێهاتن﴾ بۆ خوای گەورە هەربۆیە پێویستە جێگیرکردنی سیفەتی ﴿ سەیر لێهاتن﴾ بۆ خوای گەورە بەبێ گۆڕین و وەبەبێ پەکخستن وەبەبێ چۆنیەتی بۆدانان وەبەبێ هاوشێوە بۆدانان کەئەویش بریتیە لە ﴿ سەیر لێهاتنێکی﴾ڕاستەقینە بۆ خوای گەورە کە شایستەی خۆیەتی.

---

١ حديث ضعيف : أخرجه أحمد ( ٤/ ١٥١ ) وإبن أبي عاصم في السنة (٥٤٧) زأبة يعلى (١٤٧٩) والطبراني في الكبير (١٧/ ٣٠٩) والقضاعي في مسند الشهاب ( ٥٧٦) وتمام الرازي في فوائده (١٢٨٧) والبيهقي في الأسماء والصفات ص (٦٠٠) ونقل الحافظ السخاوي في المقاصد الحسنة ص (١٢٣) تضعيف الحافظ ابن حجر العسقلاني له في فتاويه من أجل عبدالله بن لهيعة وضعفه الألباني في الضعيفة (٢٤٢٦) وقال السخاوي : (( روينا في جزء أبي حاتم الحضرمي من حديث الأعمش عن إبراهيم قال : كان يعجبهم أن لايكون للشباب صبوة )).

* الصبوة : حەزکردن بەلای ئارەزوودا.

ويغني عن هذا الحديث في إثبات صفة العجب ما رواه البخاري (٤٨٨٩) من حديث أبي هريرة في حدبث ضعيف : لقد عجب الله عزوجل – أو ضحك – من فلان أو فلانة فأنزل الله عز وجل : ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ﴾ الحشر: ٩.

وە بەدڵنیاییەوە ئەوانەی سیفەتەکانی خوای گەورە پەکدەخەن سیفەتی ﴿ سەیر لێهاتنی﴾ خوای گەورەیان بە پاداشتدانەوە لێکداوەتەوە و ئێمەش بەرپەرچیان دەدەینەوە بەوەی لەپێشەوە لەبنەمای چوارەمدا باسکرا .

## سەیرلێهاتن دووجۆرە:

١. یەکەمیان ئەوەیە کە هۆکارەکانی شاراوەن لەکاتی ڕوودانیدا لای ئەو کەسەی سەری سوڕماوە لەوەی بینیویەتی هەربۆیە ئەو شتەی پێ سەیرەو زۆر بەگەورە سەیری دەکات و سەری لێ دەسوڕمێ کەدەیبینێت، جائەو جۆرە بەهیچ جۆرێك ناشیا و نەگەنجاوە بۆخوای گەورە لەبەرئەوەی خوای گەورە هیچ شتێك لای شاراوەنیە.

٢. دووەم : هۆکەی بریتیە لەدەرچوونی شتێك لەهاوشێوەکانی خۆی یان لەسەرئەو شتەی کەپێویستە بەوشێوەیە بێت بەڵام کە پەیدادەبێت وادەرناچێت کە هەروابووە، لەگەڵ زانستی ئەوەی سەیری لێدێت لەو شتە، وەئەوە بریتیە لەوەی کەچەسپاوە بۆخوای گەورە.

**ڕوونکردنەوەی وەرگێڕ::** ئەوەی کە مامۆستامان شێخ ئیبن و عثیمین باسی کرد لەوانەیە کەمێك تێگەیشتنی قورس بێت بۆیە من بەنمونە بۆت ڕووندەکەمەوە:

نمونە بۆ یەکەمیان : وەك ئەوەی کۆمەڵە کەسێك لەشوێنێکدا زۆر بەشێوەیەکی ئاسایی ژیان بەسەر دەبەن کەچی لە کتوپڕێکدا بومەلەرزەیەك دەیدات لەوشوێنەو زیانێکی زۆری مادی و مرۆیی لەو شوێنە دەدات ئەوانەی لەوشوێنەدان لەبەرئەوەی لەوەو پێش شتی وایان نەدیوە و نەزانیوە زۆریان پێ سەیرە چونکە ئەگەر بیانزانیایە شتێکی ئاوا لەئارادایە ئەوەی پێویست بوو بیکەن دەیانکرد، ئەم حاڵەتە بۆ مرۆڤەکان زۆر ئاساییە چونکە مرۆڤەکان زانستی نهێنیەکان نازانن و ئاگاداری نین .

بەڵام بۆ خوای گەورە ناگونجێت چونکە خوای گەورە هەموو نهێنیەك دەزانێت و هیچ شتێك لای ئەو شاراوە نیە.

نمونە بۆ دووەمیان : هەرئەوەی شێخ باسی کردووە کەئەویش گەنجێکە لەو پەڕی بارودۆخی ئارەزووبازیدایە کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ناڕوات بەلای حەزو ئارەزووداو خۆی لێ بەدوور دەگرێت . ئەوەی جێگەی سەیرلێهاتن و سەرنجە ئەوەیە هەموو گەنجان بەو قۆناغەدا تێدەپەڕن بەڵام هەندێك گەنج هەیە حەزیان بەوە نیە و خۆیانی لێ بەدوور دەگرن، ئەم جۆرە گەنجانە ئەوانەن خوای گەورە سەیری لێیان دێت چونکە وەك هاوتەمەنەکانی خۆیان ڕەفتار ناکەن، لەم بارەدا سەیرلێهاتن بۆ خوای گەورە شتێکی ئاسایی و چەسپاوە چونکە خوای گەورە باش دەزانێت بۆچی وایە .فەرموودەکەش واباسی سەیرلێهاتنی خوای گەورەدا دەکات وەك دەفەرمووێت : ﴿پەروەردگارت سەیری دێت لە گەنجێك حەزی بەلای ئارەزووبازیدا نەچێت﴾.

## ﴿ سیفەتی پێکەنین ﴾

وەهەروەها پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم دەفەرمووێت :

﴿يَضحَكُ اللهُ إلى رجُلَين يَقْتلُ أحدُهما الآخرَ يَدخُلانِ الجنّة ﴾

واتە ﴿ خوای گەورە بە دووپیاو پێدەکەنێت کە یەکێکیان ئەویتریان دەکوژێت و هەردووکیشیان دەچنە بەهەشتەوە ﴾[1]

ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

### • سیفەتی دوانزەیەم:﴿ الضحك – پێکەنین ﴾

پێکەنین یەکێکە لەسیفەتە چەسپاوەکانی خوای گەورە بە بەڵگەی سوننەت و یەکدەنگی پێشین ﴿ سەلەف ﴾.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم دەفەرمووێت :

﴿يَضحَكُ اللهُ إلى رجُلَين يَقْتلُ أحدُهما الآخرَ يَدخُلانِ الجنّة ﴾

واتە ﴿ خوای گەورە بە دوو پیاو پێدەکەنێت کە یەکێکیان ئەویتریان دەکوژێت و هەردووکیشیان دەچنە بەهەشتەوە ﴾.

---

[1] لەوانەیە پێت سەیر بێت چۆن شتی وادەبێت دوو کەس یەکێکیان ئەو یتریان دەکوژێت و هەردووکیشیان دەچنە بەهەشتەوە : خوێنەری ئازیز جێگەی سەیر نیە چونکە ئەوەی یەکەم جار شەهیدبووە بەدەستی ئەو بێ باوەڕەی شەهیدی کردووە دوایی خۆیشی موسڵمان بووە و زانراویشە سەرئەنجامی موسڵمانیش هەربەهەشتە . بۆیە دەبێت ئابەوشێوەیە لێی تێبگەین – وەرگێر.

وەتەواوی فەرموودەکە بەم شێوەیەیە : ﴿يُقَاتِلُ هَذَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيُقْتَلُ ثُمَّ يَتُوبُ اللَّهُ عَلَى الْقَاتِلِ فَيُسْتَشْهَدُ﴾ متفق عليه[1] واتە ﴿ ئەوەیان شەڕدەکات لەپێناوی خوادا و پاشان دەکوژرێت دوای ئەو ڕووداوە بکوژەکەش تەوبە دەکات و خوای گەورەش تەوبەکەی لێوەردەگرێت و ئەویش لە پێناوی خوادا شەڕدەکات و شەهید دەکرێت﴾.

وە بێگومان سەلەف یەکدەنگن لەسەر چەسپاندنی سیفەتی ﴿ پێکەنین ﴾ بۆ خوای گەورە هەربۆیە پێویستە جێگیرکردنی سیفەتی ﴿ پێکەنین ﴾ بۆ خوای گەورە بەبێ گۆڕین و وەبەبێ پەکخستن وەبەبێ چۆنیەتی بۆدانان وەبەبێ هاوشێوە بۆدانان کەئەویش بریتیە لە ﴿ پێکەنینێکی﴾ڕاستەقینە بۆ خوای گەورە کە شایستەی خۆیەتی .

وە بەدڵنیاییەوە ئەوانەی سیفەتەکانی خوای گەورە پەکدەخەن سیفەتی ﴿ پێکەنینی ﴾ خوای گەورەیان بە پاداشتدانەوە لێکداوەتەوە و ئێمەش بەرپەرچیان دەدەینەوە بەوەی لەپێشەوە لەبنەمای چوارەمدا باسکرا.

---

[1] البخاري : كتاب الجهاد : باب الكافر يقتل المسلم، ثم يسلم فيسدد بعد ويقتل ( ٢٨٢٦ ) .

ومسلم : كتاب الإمارة : باب بيان الرجلين يقتل احدهما الآخر يدخلان الجنة ( ١٨٩٠ )(١٢٨) من حديث أبي هريرة رضي الله عنه.

⟸ فهذا وما أشْبَهَهُ مِمّا صَحَّ سَنَدُهُ، وعُدِّلَت رُوَّاتُه، نُؤْمِنُ بِهِ، ولا نَرُدُّهُ، ولا نَجْحَدُهُ، ولا نَتَأَوَّلُهُ بِتأْوِيلٍ يُخالِفُ ظاهِرَه، ولا نُشَبِّهُهُ بصفاتِ المخلوقين، ولا بِسِماتِ المُحْدِثِينَ*، ونعلَمْ أنَّ اللهَ سبحانَه وتعالى لا شبيهَ لَهُ، ولا نظيرَ { لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ } ﴿الشورى: ١١﴾، وكلُّ ما تُخيِّلَ في الذِّهْنِ أوْ خَطَرَ بالبَالِ, فإنَّ اللهَ تعالى بخلافِه.

واته ﴿ جائەو فەرموودانەی كە ڕشتە ﴿ سەنەد ﴾كەیان صەحیحە و ئەوانەیشی ڕیوایەتیان كردووە بە دادپەروەر (( عدل )) دانراون ئێمە باوەڕمان پێیەتی، و ڕەدیان ناكەینەوە، و ئینكاری و ملە جیڕەی لەگەڵدا ناكەین، و ڕاڤەوتەفسیری ناكەین بە تەفسیركردنێك پێچەوانەی ڕووكەشەكەی بێت، و نایچوێنین بە سیفەتی دروستكراوەكانەوە، و بە شكڵ و شێوەی ئەو شتانەی تازە داهاتووە، وەئێمە دەزانین كە خوای گەورە هاوشێوە و هاوویێنەی نیە ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ  ﴾.

واتە ﴿هیچ شتێك هاوشێوە و هاووێنەی خوای گەورە نیە، وەهەر ئەویشە بیسەرو بینایە﴾.

وەهەموو ئەو شتانەی كەبە بیرو هۆش و مێشكی مرۆڤدا دێت دەربارەی خوای گەورە ئەوا خوای گەورە بە پێچەوانەی ئەو شتەوەیە.

---

* زاد في إجتماع الجيوش ص (١٩١ ): (( بل نؤمن بلفظه ونترك التعرض لمعناه قراءته وتفسيره )).

# ﴿ سیفەتی بەرزبوونەوە بۆ سەرعەرش ﴾

لەنمونەی ئەوە خوای گەورە دەفەرموویّت : ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ﴿٥﴾﴾ طه: ٥ واتە ﴿ ئەو خوا بەخشیندەیە چووە سەر عەرشی خۆی ﴾.

ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

- **سیفەتی سیانزەیەم:﴿ الإستواء على العرش** – بەرزبوونەوە بۆ سەر عەرش﴾

بەرزبوونەوەی خوای گەورە بۆ سەر عەرش یەکێکە لەسیفەتە چەسپاوەکانی خوای گەورە بە بەڵگەی قورئان و سوننەت و یەکدەنگی پێشین ﴿ سەلەف ﴾.

خوای گەورە دەفەرموویّت : ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ﴿٥﴾﴾ طه: ٥ واتە ﴿ ئەو خوا بەخشیندەیە چووە سەر عەرشی خۆی ﴾.

وە خوای گەورە لەحەوت شوێندا باسی بەرزبوونەوەی خۆیی بۆ سەر عەرشەکەی خۆی باسکردووە.

وە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرموویّت : ﴿إِنَّ اللَّهَ لَمَّا قَضَى الْخَلْقَ كَتَبَ عِنْدَهُ فَوْقَ عَرْشِهِ إِنَّ رَحْمَتِي سَبَقَتْ غَضَبِي﴾[1].

---

[1] البخاري : كتاب التوحيد : باب قول الله تعالى ﴿ بَلۡ هُوَ قُرۡءَانٞ مَّجِيدٞ ﴿٢١﴾ فِي لَوۡحٖ مَّحۡفُوظِۭ ﴿٢٢﴾ ﴾ البروج: ٢١ - ٢٢ (٧٥٥٤).

ومسلم : كتاب التوبة : باب في سعة رحمة الله تعالى وأنها سبقت غضبه ( ٢٧٥١ ) ( ١٤ )من حديث أبي هريرة رضي الله عنه.

واتە ﴿ خوای پەروەردگار لەكاتێكدا بڕیاریدا دروستكراوەكان دروست بكات نووسینێكی نووسی لەلای خۆی لەسەر عەرش كە بەزەیی من پێش توڕەبوونم كەوتووە﴾.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرمووێت : ﴿إِنَّ بُعْدَ مَا سَمَاءٍ إِلَى سَمَاءٍ إِمَّا وَاحِدَةٌ وَإِمَّا اثْنَتَانِ أَوْ ثَلَاثٌ وَسَبْعُونَ سَنَةً إلى أَنْ قَالَ فِي الْعَرْشِ بَيْنَ أَسْفَلِهِ وَأَعْلَاهُ مِثْلُ مَا بَيْنَ السَّمَاءِ إِلَى السَّمَاءِ ثم اللّٰهُ تعالى فَوْقَ ذَلِكَ ﴾.[1] بەهەمان شێوە هەریەك لە پێشەوایان ترمزی و ئیبن و ماجە ئەم فەرموودەیەیان ڕیوایەتكردووە و

[1] خوێنەری بەڕێز بەڕاستی ئەو فەرموودەیەی زانای ڕاڤەكار هێناویەتی من بەو شێوەیە نەم دیوە لە كتابەكانی فەرموودەدا بەڵكو ئەوەی من دیومە جیاوازە بۆیە هەمووی دێنم بۆئەوەی بۆ خۆت ببینیو شارەزای بی .

تێبینی ئەم فەرموودەیە زۆر لاوازەو ناكرێتە بەڵگە بەهیچ جۆرێك چونكە سیفەتی بەرزبوونەوەی خوای گەورە بەبەڵگەی زۆر بەهێز سەلماوە و پێویستمان بە فەرموودەی لاواز نیە تا بیكەینە بەڵگە بۆ قسەكانمان بەڵام لەبەرئەوەی شێخ هێناویەتی ئێمەش دەیهێنین تەنها لەبەر زانیاری و هیچی تر.

فەرموودەكە:: سنن أبي داود السجستاني – باب في الجهمية – جزء ٤ ص ٣٦٨:

٤٧٢٥ – حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الصَّبَّاحِ الْبَزَّازُ حَدَّثَنَا الْوَلِيدُ بْنُ أَبِى ثَوْرٍ عَنْ سِمَاكٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمِيرَةَ عَنِ الأَحْنَفِ بْنِ قَيْسٍ عَنِ الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ قَالَ كُنْتُ فِى الْبَطْحَاءِ فِى عِصَابَةٍ فِيهِمْ رَسُولُ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– فَمَرَّتْ بِهِمْ سَحَابَةٌ فَنَظَرَ إِلَيْهَا فَقَالَ « مَا تُسَمُّونَ هَذِهِ ». قَالُوا السَّحَابَ. قَالَ « وَالْمُزْنَ ». قَالُوا وَالْمُزْنَ. قَالَ « وَالْعَنَانَ ». قَالُوا وَالْعَنَانَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ لَمْ أُتْقِنِ الْعَنَانَ جَيِّدًا قَالَ « هَلْ تَدْرُونَ مَا بُعْدُ مَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ ». قَالُوا لاَ نَدْرِى. قَالَ « إِنَّ بُعْدَ مَا بَيْنَهُمَا إِمَّا وَاحِدَةٌ أَوِ اثْنَتَانِ أَوْ ثَلاَثٌ وَسَبْعُونَ سَنَةً ثُمَّ السَّمَاءُ فَوْقَهَا كَذَلِكَ ». حَتَّى عَدَّ سَبْعَ سَمَوَاتٍ « ثُمَّ فَوْقَ السَّابِعَةِ بَحْرٌ بَيْنَ أَسْفَلِهِ وَأَعْلاَهُ مِثْلُ مَا بَيْنَ سَمَاءٍ إِلَى سَمَاءٍ ثُمَّ فَوْقَ ذَلِكَ ثَمَانِيَةُ أَوْعَالٍ بَيْنَ أَظْلاَفِهِمْ وَرُكَبِهِمْ مِثْلُ مَا بَيْنَ سَمَاءٍ إِلَى سَمَاءٍ ثُمَّ عَلَى ظُهُورِهِمُ الْعَرْشُ بَيْنَ أَسْفَلِهِ وَأَعْلاَهُ مِثْلُ مَا بَيْنَ سَمَاءٍ إِلَى سَمَاءٍ ثُمَّ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى فَوْقَ ذَلِكَ ».

وه خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿كٓهيعٓصٓ ۝١﴾ مريم: ١ واتە ﴿ ئەم پێنج پیتە هێمای ئیعجازی قورئانن هەروەکو لەچەند جێگەیەکی تری قورئاندا باسکراوون ﴾.

وه خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿حمٓ ۝١ عٓسٓقٓ ۝٢﴾ الشورى: ١ – ٢

واتە ﴿ ئەم پیتانە هێمای ئیعجازی قورئانن هەروەکو لەچەند جێگەیەکی تری قورئاندا باسکراوون ﴾.

خوای پەروەردگار قورئانەکەی خۆی لە بیست و نۆ جێگەدا بەم پیتە پچڕ پچڕانە دەستپێکردووە .

وقال النبي– صلى الله عليه وسلم –«مَنْ قَرَأَ القُرْآنَ فَأَعْرَبَهُ فَلَهَ بِكُلِّ حَرْفٍ مِنْهُ عَشْرُ حَسَنَاتٍ، وَمَنْ قَرَأَهُ وَلَحَنَ فِيهِ فَلَهُ بِكُلِّ حَرْفٍ حَسَنَةٌ»حديثٌ صحيحٌ.

واتە ﴿ هەرکەسێك قورئان بخوێنێتەوە و باش لێی تێبگات و شیبکاتەوە ئەوا بە هەموو پیتێك کەدەیخوێنێتەوە دە چاکەی بۆ دەنووسرێت، وە هەرکەسێکیش بیخوێنێتەوە و لەکاتی خوێندنەوەکەیدا هەڵە بکات لە نەزانینیەوە ئەوا بە هەموو پیتێك کە دەیخوێنێتەوە چاکەیەکی بۆ دەنووسرێت ﴾. دانەر دەفەرموویت فەرموودەیەکی ڕاستە بەڵام لەڕاستیدا زۆر لاوازە[1]

---

[1] حديث ضعيف جدا : أخرجه الطبراني في الاوسط كما في المجمع الزوائد ( ٧/ ١٦٣ ) عن ابن مسعود رضي الله عنه قال : قال رسول الله صلى الله عليه وسلم ﴿أعربوا القرآن فإنه من قرأ القرآن فأعربه فله بكل حرف عشر حسنات وكفارة عشر سيئات ورفع عشر درجات﴾ وقال الهيثمي وفيه نهشل وهو متروك . ونهشل ابن سعيد بن وردان الورداني متروك وقد كذبه اسحاق بن راهوية .

وكذا أورد الحديث ابن قدامة في البرهان ص ( ٣٨، ٣٩ ) ثم قال : حديث صحيح !! والحق أنه حديث ضعيف جدا . وقد ورد في فضل قراءة القرآن عن ابن مسعود حديث آخر قريب من هذا اللفظ : ((مَنْ قَرأَ حَرْفاً مِنْ كِتَابِ الله فَلَهُ بِهِ حَسَنَةٌ وَالحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا لاَ أَقُولُ الم حَرْفٌ ، وَلكِنْ أَلِفٌ حَرْفٌ ، وَلاَمٌ حَرْفٌ ، وَمِيمٌ حَرْفٌ )) أخرجه الترمذي ( ٢٩٠ ) مرفوعا وصوب الأخ الكريم عبدالله بن يوسف وقفه ابن مسعود في بحث فريد في تذيله على كتاب (( الرد على من يقول الم حرف)) لابن منده فجزاه الله خيرا .

وقال عليْه الصّلاةُ والسّلامُ «إقْرَأُوا القُرْآنَ قَبْلَ أنْ يَأْتِيَ قَوْمٌ يُقِيمُونَ حُرُوفَهُ إقَامَةَ السَّهْمِ لا يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ يَتَعَجَّلُونَ أجْرَهُ وَلاَ يَتَأَجَّلُونَهُ»[١].

واته پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرمووێت ﴿قورئان بخوێنن پێش ئەوەی ئەو ڕۆژە دابێت کە خەڵکانێك پەیدا بن پیتەکانی ڕێك بکەنەوە هەروەکو چۆن تیر ڕاست دەکرێتەوە بەڵام لە قورقوڕاگەیان تێپەڕناکات زۆر پەلەیانە بۆ وەرگرتنی پاداشتی خوێندنەکەی و لەسەر خۆنین تا لە پاشەڕۆژدا پاداشتەکەی وەربگرن﴾ ﴿مەبەستی لەوەیە کەتەنها بۆ ئەوە دەیخوێننەوە تا خوا کارێکیان بۆ بکات بۆنمونە بیانەوێت کارێك بکەن ڕوودەکەنە خواو قورئان دەخوێنن تا کارەکەیان بۆ بکات هەرکە کارەکەیان بۆ جێبەجێکرا ئیدی نایخوێننەوە، وەهەروەها بۆ ئەوە دەیخوێننەوە تا بژێوی ژیانیانی پێدابین بکەن نەك بۆ ئەوە بیخوێننەوە تا بیکەنە یاساو ڕێسای ژیانیان ئەوانەی سیفەتیان ئاوا بێت لە قورقوڕاگەیان تێپەڕناکات - وەرگێر﴾.

وقَالَ أَبُو بَكْرٍ وعُمَرُ رضيَ اللهُ عنْهُما: إعْرابُ القُرآنِ أَحَبُّ إلَيْنَا مِنْ حِفْظِ بعْضِ حُرُوفِهِ[٢].

---

١ حديث صحيح : أخرجه أحمد ( ٥/ ٣٣٨ ) وأبو داود ( ٨٣١ ) وابن حبان ( ١٨٧٦ – موارد ) وفي اسناده ضعف ففيه وفاء بن شريح الصدفي مقبول – كما في التقريب – يعني حيث يتابع إلا فلين الحديث .

إلا أن الحديث له شواهد يتقوى بها : منها حديث جابر بن عبدالله عند أحمد ( ٣/ ٣٩٧ ) وأبو داود ( ٨٣٠ ) وإسناده صحيح كما قال الألباني في الصحيحة ( ٢٥٩) .

والحديث أورده ابن قدامة في البرهان ص ( ٣٥، ٣٦ ) من حديث سها بن سعيد .

٢ أثر ضعيف جدا : أخرجه ابن الأنباري في الوقت والإبتداء ( ١/ ٢٠ ) بلفظ (( لبعض إعراب القرآن أعجب إلينا من حفظ بعض حروفه )) وإسناده ضعيف جدا فيه ضعف وإنقطاع فسه جابر بن يزيد الجعفي وهو ضعيف وكذا شريك القاضي صدوق يخطيء كثيراً وتغير حفظه وانقطاع بين أبي بكر وعمر وبيت الراوي عنهما . عن تعليق بدر البدر على اللمعة ص ( ١٩ ).

وأورده إبن قدامة في البرهان ص ( ٤٤ ).

وە پێشەوایان ئەبوبەکرو عومەر ڕەزای خوایـان لێ بێـت دەفـەرموون : تێگەیـشتن و شیکردنەوەی قورئانمان پێخۆشترە لەلەبەرکردنی هەندێك لە پیتەکانی .

وقالَ عليٌّ – رضي الله عنه –: مَنْ كَفَرَ بِحَـرْفٍ مِنْـهُ فَقَـدْ كَفَـرَ بِـهِ كُلِّـهُ.

وە پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێت دەفەرموویت : ﴿ هەرکەسـێك بێبـاوەڕ بێـت بـە پیتێکی قورئان ئەوا بێباوەڕ بووە بە هەموو قورئان ﴾.

واتَّفَقَ المسلمون على عَدِّ سُوَرِ القرآنِ وآياتِهِ وكلِماتِهِ وحُروفِهِ.

وە هەموو موسڵمانان یەکدەنگن لەسەر ژماردنی سورەتەکانی قورئان و ئایەتەکانی و وشەکانی و پیتەکان .

ولا خِلافَ بيْن المسلمين في أنَّ مَنْ جَحَدَ مِنَ القُرآنِ سُورَةً أو آيَةً أو كلِمَـةً أو حرْفًا مُتَّفَقًا عليْه أنَّه كافِرٌ، وفي هذا حُجَّةٌ قاطِعَةٌ على أنَّهُ حُروفٌ.

وە هیچ جیاوازییەك نیە لـە نێـوان موسـڵماناندا لـەوەدا کـە هەرکەسـێك ئینکـاری سورەتێك یان ئایەتێك یان وشەیەك یان پیتێك لە قورئان بکات یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە ئەو کەسە بێباوەڕە، وەلەوەشدا بەڵگەیەکی بڕاوە هەیە لەسەر ئەوەی کە قورئان لـە پیت پێکهاتووە .

## ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

### ﴿ قورئان پیتەکان و وشەکانە ﴾

قورئانی پیرۆز پیتەکان و وشەکانە وە بێگومان دانەر ڕەحمەتی خوای لێ بێت بۆ ئەوە ٨ بەڵگەی هێناوە :

١- بێباوەڕەکان ووتویانە قورئان هۆنراوەیە وەبە هیچ جۆرێك ناگونجێت بەو شێوەیە وەسفبکرێت تەنها بەوە نەبێت کە قورئان بریتە لە پیتەکان و وشەکان[1] .

٢- خوای گەروە سەرپشکی درۆزنەکانی کردووە بەوەی بتوانن بە وێنەی ئەو قورئانە بێنن ئەگەر چیش لە پیتەکان و وشەکان نەبێت، ئەو سەرپشکردنە جێگەی پەسەندکردن نیە لەبەرئەوەی سەرپشکردن ناکرێت ئەنجام بدرێت تەنها بە شتێك نەبێت زانراو بێت و بزانرێت کە بریتیە لە چی .

٣- خوای گەورە هەواڵیداوە بەوەی کە قورئان دەخوێندرێتەوە بەسەریاندا :

﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَاتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا ٱئْتِ بِقُرْءَانٍ غَيْرِ هَٰذَآ أَوْ بَدِّلْهُ﴾ يونس: ١٥ واتە ﴿ وە هەرکە ئایەتە ڕوونەکانمان بۆیان بخوێنرێتەوە ئەوانەی کە ئومێدیان بە دیداری ئێمە نیە دەڵێن : جگە لەم قورئانە نامەیەکی ترمان بۆ بێنە یان هەر بیگۆڕە بە شتێکی تر ﴾.

وە ناشخوێندرێتەوە تەنها ئەوە نەبێت کە پێکهاتبێت لە پیتەکان و وشەکان.

---

[1] قال ابن قدامة في البرهان ص ( ٢٧ ) : (( ومن المعلوم أنما عنوا هذا النظم، لإن الشعر كلام موزون، فلا يسمى به معنى ولا ماليس بكلام، فسماه الله تبارك وتعالى ذكرا وقرآنا مبينا )) أ . هـ .
وراجع الأدلة من الكتاب والسنة والإجماع على أن القرآن حروف وكلمات في البرهان في بيان القرآن لابن قدامة ص (٢٦:٨٣)

٤- خوای گەورە هەواڵی داوە بەوەی کە قورئان پارێزراوە لە سینگ و دڵی ئەو کەسانەدا زانیاریان پێدراوە وە نووسراوە لە ﴿ لوح المحفوظ ﴾ دا .

﴿ بَلْ هُوَ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ فِى صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ﴾ العنكبوت: ٤٩ واتە ﴿ بەڵکو ئەو قورئانە چەند ئایەتێکی ڕوون و ئاشکراو پارێزراوە لە سینگ و دڵی ئەو کەسانەدا زانیاریان پێدراوە ﴾.

﴿إِنَّهُۥ لَقُرْءَانٌ كَرِيمٌ ﴿٧٧﴾ فِى كِتَٰبٍ مَّكْنُونٍ ﴿٧٨﴾ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ ﴿٧٩﴾﴾ الواقعة: ٧٧ – ٧٩ واتە ﴿ بەڕاستی ئەوە قورئانێکی بە ڕێزە، لە نامەیەکی پارێزراودایە واتە ﴿لوح المحفوظ﴾، کەس دەستی لێنادات فریشتەکان نەبێت ﴾.

وە ناپارێزرێت و نانووسرێت تەنها ئەوە نەبێت کە لە پیتەکان و وشەکان پێکهاتبێت.

٥- وە بەڵگەیەکی تر پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرمووێت:

«مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ فَأَعْرَبَهُ فَلَهُ بِكُلِّ حَرْفٍ مِنْهُ عَشْرُ حَسَنَاتٍ، وَمَنْ قَرَأَهُ وَلَحَنَ فِيهِ فَلَهُ بِكُلِّ حَرْفٍ حَسَنَةٌ» صححه المؤلف ولم يعزه ولم أجد من خرجه[1].

واتە ﴿ هەرکەسێك قورئان بخوێنێتەوە و باش لێی تێبگات و شیبکاتەوە ئەوا بە هەموو پیتێك کەدەیخوێنێتەوە دە چاکەی بۆ دەنووسرێت، وە هەرکەسێکیش بیخوێنێتەوە و لەکاتی خوێندنەوەکەیدا هەڵە بکات لە نەزانینیەوە ئەوا بە هەموو پیتێك کە دەیخوێنێتەوە چاکەیەکی بۆ دەنووسرێت ﴾.

٦- وە بەڵگەیەکی تر وتەکەی پێشەوایان ئەبوبەکرو عومەرە ڕەزای خوایان لێ بێت دەفەرموون : ﴿إِعْرابُ القُرآنِ أَحَبُّ إلَيْنَا مِنْ حِفْظِ بعْضِ حُرُوفِهِ ﴾ ﴿تێگەیشتن و شیکردنەوەی قورئانمان پێخۆشترە لەلەبەرکردنی هەندێك لە پیتەکانی ﴾ .

[1] وقد تقدم أنه غير صحيح وأنه حديث ضعيف جداً عزاه الهيثمي في المجمع للطبراني في الأوسط وفيه نهشل بن سعيد متروك.

٧- وە بەڵگەیەکی تر وتەکەی پێشەوا عەلیە ڕەزای خوای لێ بێت کە دەفەرمووێت: ﴿مَنْ كَفَرَ بِحَرْفٍ مِنْهُ فَقَدْ كَفَرَ بِهِ كُلِّهُ﴾ ﴿ هەرکەسێك بێباوەڕ بێت بە پیتێکی قورئان ئەوا بێباوەڕ بووە بە هەموو قورئان ﴾.

٨- وە بەڵگەیەکی تر یەکدەنگی پێشینە هەروەکو دانەر بۆی گواستوینەتەوە : على أنَّ مَنْ جَحَدَ مِنَ القُرآنِ سُورَةً أو آيَةً أو كلِمَةً أو حرْفًا مُتَّفَقًا عليْه فهو كافِرٌ.

لەسەر ئەوەی کە هەرکەسێك ئینکاری سورەتێك یان ئایەتێك یان وشەیەك یان پیتێك لە قورئان بکات یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە ئەو کەسە بێباوەڕە .

وە ژمارەی سورەتەکانی قورئان پێکهاتووە لە ١١٤ سورەت لەوانە ٢٩ سورەتیان بە پیتە پچڕ پچڕەکان دەستی پێکردووە .

## ﴿ وەسفەکانی قورئان ﴾

خـوای گـەورە قورئـانی پـیرۆزی بــە چــەندین وەســفی زۆر و گــەورە و مــەزن وەسفکردووە کە دانەری پەرتووکەکە ئەمانەی لێ باسکردووە :

١- قورئان پەرتووکی ڕوون و ئاشکرای خوای گەورەیە، واتـە ڕوونکـەرەوەی ئـەو ئەحکام و یاساو هەواڵانەیە کە لە خۆیی گرتووە .

٢- قورئان پەتی پتەو بەهێزی خوای گەورەیە، واتە ئەو پەیمانە بەهێزەیـە کـە خـوای گەورە کردوویەتیە هۆکارێك بۆ گەیشتن پێی و سەرکەوتن بە هۆی پیرۆزیەکەیەوە .

٣- قورئـان پێکهـاتووە لــە کۆمەڵــە ســورەتێکی تـەئویل هەڵنــەگرو پتــەو، واتــە سورەتەکانی لە یەکدی جوودان و هەموو سورەتێك بۆخۆی جیاکراوەیە لە سورەتەکەی تر، وە واتای موحکەماتیش بریتیە لە کۆمەڵە سورەتێکی جوان و ورد داڕێژراو پارێزراو لە هەموو خەوش و ناتەواوی و کەم و کورتیەك.

٤- قورئان پێکهاتووە لە کۆمەڵە سورەتێکی بەڵگە ڕوون و دیار، واتە بریتیە لە کۆمەڵە نیشانەیەکی ئاشکرا لەسەر یەکخواناسی خوای گەورە و تەواویەتی سیفەتەکانی و جوانی شەریعەت و یاساکانی.

٥- لە قورئاندا موحکەم و موتەشابە هەیە، جا ئەوەی کە موحکەمە ئەوەیە کە واتاکەی ڕوون و ئاشکرایە، وە موتەشابیهیش ئەوەیە کە واتاکەی شاراوەیەو دیار نیە ئەمەش بەگژداچوونەوەی ئەوە نیە کە لە خاڵی سێهەمدا باسکرا لەبەرئەوەی ﴿الإحكام﴾ لەوێدا بەواتای ﴿ جوان و ورد دارێژراو پارێزراو لە هەموو خەوش و ناتەواوی و کەم و کورتیەك ﴾ دێت، وەلێرەدا بەواتای ﴿ ڕوونی ماناکەی ﴾ دێت، وەئەگەر بێت و ﴿ المتشابه – وێکچوو ﴾ لێرەدا بگێڕینەوە بۆ ﴿ محكم – پتەو ﴾ ئەوا هەرهەمووی دەبێتە موحکەمو هیچ جۆرە بەگجداچوونەوە و دژایەتیەك لە نێوانیاندا نابێت.

٦- قورئان هەر هەمووی هەق و ڕاستەو هەرگیز ناگونجێت پووچی و بەتاڵی لە هیچ لایەکیەوە بێت : ﴿ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴿٤٢﴾ ﴾ فصلت: ٤٢

واتە ﴿ هەرگیز ڕەفتارو گوفتاری هیچ و پوچی تیَ نایەت، نەلە پێش خۆیی و نەلەپاش خۆی چوون لەلایەن خوایەکی قسە لە جیَ و هەمیشە سوپاسکراوە وە نێردراوە ﴾

٧- قورئان زۆر دوورە لەو وەسفەی درۆزنەکان بۆیان کردووە بەوەی کە هۆنراوەیە :

﴿ وَمَا عَلَّمْنَٰهُ ٱلشِّعْرَ وَمَا يَنۢبَغِى لَهُۥٓ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْءَانٌ مُّبِينٌ ﴿٦٩﴾ ﴾ یس: ٦٩ واتە : ﴿ئێمە هەرگیز شیعرو هۆنراوەمان فێری محمد صلى الله عليه وعلى آله وسلم

نەکردووەو هۆنراوە ووتنیش شیاوی ئەو نیە ئەوەیش کە ئەو دەیلێت هەر پەندو ئامۆژگاری و قورئانێکی ڕوون و ئاشکرایە نەك شیعر ﴾.

وە لە وتەی هەندێکی تریان کە ووتویانە : ﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ ﴿٢٤﴾﴾ المدثر: ٢٤ واتە ﴿ ئەم قورئانە هەر جادووە لە خەڵکێکی ترەوە وەریدەگرێت ﴾.

﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّا قَوْلُ ٱلْبَشَرِ ﴿٢٥﴾﴾ المدثر: ٢٥ واتە ﴿ئەمە هەر قسەی مرۆڤەو لە قسەی خوا ناچێت ﴾.

جا خوای گەورە هەڕەشە لە بێژەری ئەو قسەدەکات و دەفەرمووێت : ﴿سَأُصْلِيهِ سَقَرَ ﴿٢٦﴾﴾ المدثر: ٢٦ واتە ﴿ ئەیخەمە ناو سەقەرەوە ﴾.

٨- قورئانی پیرۆز موعجیزەیە و هیچ کەس ناتوانێت کە وێنەی ئەو بێنێت ئەگەر چی جگە لە خۆیشی یارمەتی بدەن هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێت : ﴿ قُل لَّئِنِ ٱجْتَمَعَتِ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأْتُوا۟ بِمِثْلِ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِۦ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ﴿٨٨﴾﴾ الإسراء: ٨٨ .

واتە ﴿ بڵێ : ئەگەر هەموو مرۆڤ و پەریەکان کۆببنەوە بۆ ئەوەی وێنەی ئەم قورئانە بهێنن هەرگیز ناتوانن وێنەی ئەو بهێنن ئەگەر هەندێکیان پاڵپشت و هاوکاری هەندێکیان بن بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە ﴾.

## بینینی باوەڕداران بۆ پەروەردگاریان لە ڕۆژی قیامەتدا

والمؤمنون يَرَوْنَ رَبَّهُمْ فِي الآخرةِ بأبْصارِهِم، ويَزُورُونَهُ، ويُكَلِّمُهُم ويُكَلِّمُونَهُ، قال الله تعالى ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ (٢٢) إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ (٢٣)﴾ القيامة: ٢٢ – ٢٣

واتە ﴿ لەڕۆژی قیامەتدا ڕووی باوەڕداران گەشاوە و پرشنگدارە بۆ پەروەردگاری خۆیان دەڕوانن ﴾

وە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ (١٥)﴾ المطففين: ١٥

واتە ﴿ ئاگاداربن ! بەڕاستی ئەوان لەو ڕۆژەدا ڕێگرییان لێدەکرێت لەوەی پەروەردگاریان ببینن ﴾ .

فلمَّا حَجَبَ أولئك في حالِ السُّخْطِ دَلَّ على أنَّ المؤمنين يَرَوْنَهُ في حالِ الرِّضَا و إلاّ لم يَكُنْ بَيْنَهُمَا فَرْقٌ.

جا لەکاتێکدا ڕێگری لەوانە کرا لەوەی خوای گەورە ببینن لە حاڵێکدا کە خوای گەورە تورەیە لە بێباوەڕان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە باوەڕداران دەتوانن پەروەردگاریان ببینن لە حاڵی ڕازیبووندا وە ئەگەر نا ئەوا جیاوازی نەبوو لە نێوان ئەو دوو حاڵەتەدا.

وقال النبي– صلى الله عليه وسلم –«إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ كَمَا تَرَوْنَ هَذَا الْقَمَرَ، لاَ تُضَامّونَ فِي رُؤْيَتِهِ» حديث صحيح متفق عليه.

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرموویت : ﴿ ئێوە پـەروەردگاری خۆتان دەبینن هەروەکو چۆن مانگ دەبینن تووشی هیچ ناڕەحەتیەك نـابن لـە بینـینی دا بەیەکسانی ﴾[1].

وهذا تشبيهٌ للرؤيةِ بالرؤيةِ لا للمرئيِّ بالمرئيِّ، فإنّ الله تعالى لا شبيهَ له ولا نظيرَ.

ئەو وێکچوواندنە لەیەکچوونە بۆ بینین بە بینین نەك لەیەکچوون بێت بـۆ بینـراو بـە بینراو[2] لەبەر ئەوەی خوای گەورە وێکچوو هاو وێنەی نیە.

---

١ البخاري : كتاب مواقيت الصلاة : باب فضل صلاة الفجر ( ٥٧٣).
ومسلم : كتاب المساجد ومواضع الصلاة : باب فضل صـلاتي الـصبح والعـصر والمحافظـة عليهمـا ( ٦٣٣) (٢١١) من حديث جرير بن عبدالله رضي الله عنه .
وأحاديث الرؤية متواترة كما نص على ذلك غير واحد من أهل العلـم مـنهم : ابـن القـيم في حـادي الأرواح ص ( ٢٧٧) وابن أبي العز في شرح الطحاوية (١/ ٢١٥) والحافظ ابن حجر في فتح الباري ( ١/ ٢٠٣) .
وراجع ما صنف في مثل هذه السألة مثل : التصديق بالنظر إلى الله تعالى في الآخـرة للآجـري، وضـوء الساري إلى معرفة رؤية الباري لأبي شامة المقدسي وكلاهما مطبوع.

٢ خوێنەری بەڕێز پێویستە لێرەدا ڕوونکردنەوەیەك باس بکەین کە ئـەویش ئەوەیـە پێغەمبـەری خـوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم کە دەفەرموێت : ﴿ ئێوە پـەروەردگاری خۆتـان دەبیـنن هـەروەکو چۆن مانگ دەبینن تووشی هیچ ناڕەحەتیەك نابن هەمووتان بەیەکـسانی دەیبیـنن ﴾ مەبەسـتی ئەوەیـە چۆن کاتێك مانگ لە شەوی چواردەدا زۆر دیارو ئاشکرایە و هەموو کەسێ دەیبینێت و هیچ کەسێ بە کەسێکی تر نالێت بەئەرك نەبێت کەمێ خۆت لابدە با منیش ببیـنم چـونکە مـانگ لەبەرزیدایـە هەرکەسێك لە شوێنی خۆی سەر بەرز بکاتەوە ڕاستەو خۆ مانگە درەوشاوەکە دەبینێت ئابەو شێوەیە لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە دەبینرێت لە لایەن باوەڕدارانەوە چونکە خـوای پـاك و بێگـەرد لـە بەرزیدایە و هەموو باوەڕداران بەیەکسانی و بە بێ هیچ ناڕەحەتیەك دەتوانن ببینن ئەم وێکـچوواندنە ئەوەی لە تێناگەین کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم خوای گەورەی وەکـو مـانگ لێکردبێت، نەخێر ئەو قسەیە دوورە لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وعلى آله وسلم بەڵکو ئـەو تەنها بینینەکەی وەکو یەك لێکردووە واتە چۆن مانگەکە دەبینن ئاوا خـوای خۆتـان دەبیـنن کەوتـە تەنها بینینەکانی شوبهاند بەیەکەوە نەك بینراوەکان کـە مـانگ و خـوای گەورەیـە چـونکە ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَيْءٌ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾ ﴾ الشورى: ١١﴿ وەرگێڕ ﴾.

ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

## ﴿بینینی خوای گەورە لە دواڕۆژدا﴾

بینیی خوای گەورە لە دونیادا بەهیچ جۆرێك ڕوونادات لەبەر فەرموودەی خوای گەورە بە موسای فەرموو سەلامی خوای لیّ بێت کاتێك داوای لێکرد ببینێت:

﴿لَن تَرَىٰنِي﴾ الأعراف: ١٤٣ واتە ﴿ هەرگیز ناتوانیت ببینی ﴾ .

وە بینی خوای گەورە جێگیرو چەسپاوە بە بە بەڵگەی قورئان و سوننەت و یەکدەنگی پێشین ﴿ سەلەف ﴾.

خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ (٢٢) إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ (٢٣) ﴾ القيامة: ٢٢ – ٢٣

واتە ﴿ لەڕۆژی قیامەتدا ڕووی باوەڕداران گەشاوە و پرشنگدارە بۆ پەروەردگاری خۆیان دەڕوانن ﴾.

وە هەروەها دەفەرموویت : ﴿ كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ (١٥) ﴾ المطففين: ١٥

واتە ﴿ ئاگاداربن ! بەڕاستی ئەوان لەو ڕۆژەدا ڕێگرییان لێدەکرێت لەوەی پەروەردگاریان ببینن ﴾ .

جا کاتێك تاوانباران ڕێگریان لێدەکرێت لەوەی ببینن بەڵگەیە لەسەر ئەوەی چاکەکاران خوای گەورە دەبینن وە ئەگەر نا ئەوا جیاوازی نەدەبوو لە نێوانیاندا .

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرموویت : ﴿ إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ كَمَا تَرَوْنَ هَذَا الْقَمَرَ، لاَ تُضَامّونَ فِي رُؤْيَتِهِ ﴾ متفق عليه.

﴿ ئێوە پەروەردگاری خۆتان دەبینن هەروەکو چۆن مانگ دەبینن تووشی هیچ نارەحەتیەك نابن لە بینینی دا بەیەکسانی﴾

ئەو وێکچوواندنە لەیەکچوونە بۆ بینین بە بینین نەك لەیەکچوون بێت بۆ بینراو بە بینراو لەبەرئەوەی خوای گەورە هیچ شتێك وێکچوو هاوشێوە و هاو وێنەی نیە.

وە پێشین یەکدەنگن لەسەر بینینی خوای گەورە لەلایەن باوەڕدارانەوە بەتەنها بێئەوەی بێباوەڕان ببینن بەبەڵگەی ئەم ئایەتە ﴿ كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ﴿١٥﴾ ﴾ المطففين: ١٥

* باوەڕداران خوای گەورە لەمەیدانی حەشردا و دوای چوونە ناو بەهەشت دەبینن کەئەوەش بریتیە لە بینینێکی ڕاستەقینە کە شایستەی خۆیەتی.

وە بەدڵنیاییەوە ئەوانەی سیفەتەکانی خوای گەورە پەکدەخەن سیفەتی بینینی خوای گەورەیان بە بینینی پاداشتی خوا لێکداوەتەوە یان ووتویانە مەبەست لێی بینینی زانستو دڵنیاییە ئێمەش بەرپەرچیان دەدەینەوە بەوەی لەپێشەوە لەبنەمای چوارەمدا باسکرا وە لەڕوویەکی تریشەوە کە زانست و دڵنیایی هەرلەدونیادا بۆ چاکەکاران هاتۆتە جێ وە لە دوارۆژیشدا دێتە جێ بۆ خراپەکاران و دێتە دی[1].

---

١ بگەڕێرەوە بۆ بەرپەرچدانەوەی سەرپێچیکاران : حادي الأرواح لابن القيم. وشرح الطحاوية لابن أبي العز وكذا حديثاً : دلالة القرآن والأثر على رؤية الله بالبصر لعبدالعزيز بن زيد الرومي.

## بەشی ﴿ قەزا و قەدەر ﴾

ومِنْ صِفاتِ اللهِ تعالى أَنَّهُ الفَعَّالُ لِمَا يُريدُ لَا يَكُونُ شَـيءٌ إلَّـا بإرادَتِـهِ وَلَـا يَخْرُجُ شَيءٌ عَنْ مَشِيئَتِهِ وَلَيْسَ في العالَمِ شيْءٌ يَخْرُجُ عَنْ تَقْدِيرِهِ وَلَا يَصْدُرُ إلا عَنْ تدبيرِهِ، ولا مَحِيدَ عَنِ القدَرِ المقدورِ، ولا يتجاوَزُ ما خُطَّ في اللَّوحِ المسْطورِ أَرَادَ ما العالَمُ فاعِلوهُ، وَلَوْ عَصَمَهُم لَمَا خالَفوهُ، وَلَوْ شاءَ أنْ يُطِيعُوهُ جَمِيعًا لأَطاعُوهُ، خَلَقَ الخَلْقَ وأفعالَهم، وقَـدَّرَ أَرْزَاقَهُم وآجَالَهُم، يَهْدِي مَنْ يَشاءُ بِحِكْمَتِه .

وە یەکێکی تر لـە سیفەتەکانی خوای گەورە ئەوەیە کە هەرچییەکی بوێ دەیکـات وە هیچ شتێکیش ڕوونادات تەنها بە ویستی ئـەو نـەبێت وە هـیچ شـتێکیش ناتوانێـت لـە ویستی ئەو دەربچێت وە هیچ شتێك لـە جیهاندا نیە بەدەربێت لە ئەنـدازەدانانی ئـەو وە دەرناچێت تەنها لـە ژێر بەڕێوە بردنی ئەودا نـەبێت، وە هـیچ ئەنـدازە بۆدانراوێـك نیـە دورخراوە و بێ لایەن بێت لـە لە ئەندازەکە، وە تێپـەڕیش ناکـات لـەوەی لـە ﴿ لـوح المحفوظ ﴾ دا نووسراوە و هێڵی بۆ کێشراوە، بەویـست و ئـارەزووی ئـەوە ئـەوەی لـە جیهاندا ڕوودەدات و دەکرێت، وەئەگەر بیویستایە پارێزراوبن لـەوەی تاوان ئەنجام بدەن ئەوا هەرگیز سەرپێچیان نەدەکرد، وەئەگەر بیویستایە هەرهەموویان گوێڕایەڵی بـن ئـەوا گوێڕایەڵیان دەکرد، هەرچی دروستکراو هەیـە خۆیـان و کردەوەکانیـشان هـەر خـۆی دروستی کردوون، وە هەرخۆی پێوانەی ڕۆزییان و ئەنـدازەی تەمـەنیانی دیـاریکردووە، وەبیەوێت هەرکەسێك ڕێنمویی بکات ئەوا بە دانایی خۆی ڕێنموییان دەکات .

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ الأنبياء: ٢٣

واتە ﴿ پرسیار ناکرێت لەوەی خـوای گـەورە دەیکـات بـەڵکو ئـەوانن پرسـیاریان لێدەکرێت ﴾ .

وەهەروەها دەفەرموویت : ﴿ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾ ﴾ القمر: ٤٩ واتە ﴿ ئێمە هەموو شتێکما بە ئەندازە بە دیهێناوە ﴾ .

وەهەروەها دەفەرموویت : ﴿ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا ﴿٢﴾ ﴾ الفرقان: ٢ واتە ﴿ هەموو شتێکی لە نەبوونەوە بەدیهێناو ئەندازەگیری تەواویشی بۆ کرد ﴾ .

وەهەروەها دەفەرموویت : ﴿ مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَا ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٢٢﴾ ﴾ الحديد: ٢٢ واتە ﴿ هیچ بەڵاو نەهامەتیەك ڕوونادات نەلەزەویدا و نە لە خۆشتاندا تووشتان دەبێت کە لە کتێبێکدا تۆمارمان نەکردبێت پێش ئەوەی ڕووداوەکە بەدیبهێنین ئەو کارەش لای خوای گەورە زۆر ئاسانە ﴾.

وەهەروەها دەفەرموویت : ﴿ فَمَن يُرِدِ اللَّهُ أَن يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ ۖ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا ﴾ الأنعام: ١٢٥ واتە ﴿ جائەو کەسەی خوای گەورە بیەوێت ڕێنموویی بکات ئەوا سینەی ساف و پاك و ئامادە دەکات بۆ وەرگرتنی ئیسلام ئەو کەسەش خوای گەورە بیەوێت گومڕایی بکات ئەوا دڵی دەگوشێت و سینگی توند دەکات و هەناسەی سوار دەبێت ﴾.

⇦ ورَوَى ابنُ عُمَرَ أنَّ جِبْرِيلَ عليه السلامُ قال للنبي – صلى الله عليه وسلم–: ما الإيمان؟ قال«أنْ تُؤْمِنَ بِالله وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَاليَوْمِ الآخِر، وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ» فقال جبريل: صَدَقْتَ[١]. رواه مسلم.

---

١ مسلم : كتاب الإيمان : باب بيان الإيمان والإسلام والإحسان ... (٨) (١) وفي الباب : باب سؤال جبريل النبي صلى الله عليه و سلم عن الإيمان والإسلام والإحسان وعلم الساعة عن أبي هريرة رضي الله عنه: عند البخاري (٥٠) ومسلم (٩ ) (٥).

وە عبداللە ی کوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێ بێت ڕیوایەتی کردووە کە جیبریل سەلای خوای لێ بێت بە پێغەمبەری خوای صلى الله عليه وعلى آله وسلم فەرموو: باوەڕ چیە؟ ئەویش صلى الله عليه وعلى آله وسلم فەرمووی :﴿ باوەڕ بریتیە لەوەی باوەڕت بە خوا و فریشتەکان و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی سەلامی خوایان لێ بێت و ڕۆژی دوایی و قەزاو قەدەر بە خێرو شەڕیەوە هەبێت ﴾.

وقال النبيُّ – صلى الله عليه وسلم – «آمنتُ بالقدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ، وَحُلْوِهِ وَمُرِّهِ»[1].

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرمووێت :﴿ باوەڕم بە قەدەر هەیە بە خێرو شەڕو خۆشی و ناخۆشیەوە ﴾

ومِنْ دُعَاءِ النَّبِيِّ – صلى الله عليه وسلم – الّذي علَّمَهُ الحسَنَ بْنَ عَلِي يَدْعُو بِهِ فِي قُنُوتِ الوِتْرِ«وَقِنِي شَرَّ مَا قَضَيْتَ»[1].

---

[1] إسناده ضعيف : أخرجه الحاكم في معرفة علو الحديث ( ٣١, ٣٢ ) ومن طريقه العراقي في شرحه لألفية ص (٣٢٧ ) كمثال للحديث المسلسل بأحوال الرواة القولية والفعلية معا من طريق يزيد الرقاشي عن أنس بن مالك سمعت رسول الله صلى الله عليه وعلى آله وسلم يقول : ((لايجد العبد حلاوة الإيمان حتى يؤمن بالقدر خيره وشره حلوه ومره )) ورأيت رسول الله صلى الله عليه وعلى آله وسلم قيض على لحيته ثم قال : (( آمنت بالقدر خيره وشره حلوه ومره )) قال وقبض أنس على لحيته فقال : ((آمنت بالقدر خيره وشره حلوه ومره .... )) الحديث . وقال الحاكم بعد أن سال تسلسل الرواة على هذه الصفة : (( وأنا أقول عن نية صادقة وعقيدة صحيحة : آمنت بالقدر خيره وشره حلوه ومره )) ويزي د الرقاشي ضعيف كما في التقريب ( ٧٦٨٣) بل قال النسائي فيه : متروك وقال أحمد منكر الحديث كما في الميزان ( ٤/ ٤١٨).

والحديث عزاه الشيخ ياسين الفاداني في ورقات في (( مجموعة المسلسلات والأوائل الأسانيد العالية )) ص(٦, ٧) للديلمي في مسند الفردوس.

وەلە نزاكانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم كه فێری حەسەنی كوڕی عەلی ڕەزای خوایان لێ بێت كه لە قنوتی وتردا بیخوێنێت ئەوە بوو كه دەیفەرموو : ﴿وە خوایەگیان بمپارێزە لەشەڕی ئەوەی بڕیارت لێ داوە ﴾.

---

١ حديث صحيح : أخرجه أحمد ( ١٧٢٣) وأبوداود ( ١٤٢٥, ١٤٢٦) والترمذي (٤٦٤) والنسائي (٣ ٢٤٨) وابن ماجة ( ١١٧٨) وإسناده صحيح وقد صححه الشيخ أحمد شاكر في تعليقه على سنن الترمذي .

سوودێك : شێخ ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە كتێبی ﴿ دروس فتاوى الحرم المكي ﴾ ساڵی ١٤٠٨كۆچی لە لاپەڕە ١٣٦ دا لە ڕاڤەی دوعای قنوتدا دەفەرموێت : «وَقِنا شَرَّ مَا قَضَيْتَ» : خوای پەروەردگار بڕیاری خێرو شەڕ دەدات : هەرچی دەربارەی بڕیاردانیەتی بەخێر ئەوە هەرهەمووی خێرە لە بڕیارەكەدا و خێرە بۆئەو كەسەشی بڕیارەكەی لەبارەوە داوە بۆنمونە : كە خوای پەروەردگار بڕیاربدات بۆ خەڵكی بە پێدانی ڕزق و ڕۆزییەكی فراوان وئاسایش و ئارامیتی و هیدایەت و سەركەوتن كەهەریەك لەمانە خێرە هەرچیەكی تریش وەكو ئەمانە وابێت، ئائەوە خێرە لەبڕیارەكەدا و بۆ ئەو كەسەشی بڕیارەكە لەبارەیەوە دراوە، بەڵام ئەوەی دەربارەی بڕیاردانیەتی بە شەڕ ئەوە خێرە لە بڕیارەكەدا و شەڕە بۆ ئەوەی بڕیارەكەی لەبارەوە دراوە وە نمونەی ئەوەش : گرانی و بێ بارانی جائەوە شەڕە بەڵام بڕیاری خوا خێری پێوەیە، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾ ﴾ الروم: ٤١ واتە ﴿ پشێوی : واتە برسیەتی و قات و قڕی و گرانی نائارامی و گرانی خنكان و نەخۆشی و بومەلەرزە لە ووشكانی و دەریادا بەدیاركەوت بەهۆی تاوان و گوناهی خەڵكەوە بۆئەوەی هەندێ تاڵاوی كردەوەكانیان پێ بچێژێت بەڵكو هۆش بكەنەوە و پەشیمان بنەوە و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا ﴾ جا ئەو بڕیاردانە مەبەستێكی پیرۆزە كە ئەویش بریتیە لە گەڕانەوە بۆ لای خوا و دەست هەڵگرتن لە تاوانكردن و سەرپێچیكردنی بۆ گوێڕایەڵیكردنی جابۆ بڕیارلێدراوەكە بوو بە شەڕ وە بڕیارەكەش خێرە ﴾ ﴿ مەبەست لەو بڕیاردانە هۆشیاركردنەوەی بەندەكانە تا واز لە تاوان بێنن و بگەڕێنەوە سەر ڕێگەی ڕاست كەئەمە خێرە بەڵام بە نیسبەت ئەوانەی بڕیارەكەیان بەسەردا جێبەجێ كراوە شەڕە چونكە ماڵ وێرانی و دەربەدەری و كوشتاری تێدابووە – وەرگێڕ ﴾.

وە ئێمەش دەڵێین ﴿شَرَّ مَا قَضَيْتَ﴾ ئەو ﴿ ما ﴾ ە لێرەدا ﴿ إسم موصول ﴾ ە واتە ئەو شەڕەی بڕیارت لێداوە، چونكە خوای گەورە هەندێ جار بڕیار بەشەڕ دەدات لەبەر حیكمەتێكی زۆر بەرزو پیرۆز .

## ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

قەدەر : یەکێ لە سیفەتەکانی خوای گەورە ئەوەیە کە هەرچیەکی بوێ دەیکات هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێت : ﴿ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٠٧﴾ ﴾ هود: ١٠٧

واتە ﴿ پەروەردگاری تۆ هەرچیەکی بوێت دەیکات ﴾ .

جابۆیە هیچ شتێك بەدەرنیە لە ویست و دەسەڵاتی ئەو وە هیچ شتێکیش ڕووناداتو نایەتە کایەوە تەنها بە ئەندازەگیری و بەڕیوەبردنی ئەو نەبێت، بەدەستی ئەوە هەموو موڵکی ئاسمانەکان و زەوی، بیەوێت هەرکەسێك ڕێنموی بکات ئەوا بەبەزەیی خۆی ڕێنموییی دەکات، وە بیەوێت هەرکەسێك گومڕا بکات ئەوا بە دانایی خۆی گومڕای دەکات، پرسیاری لێناکرێت دەربارەی هەر شتێك کە بیکات لەبەر تەواویەتی دانایی و دەستەڵاتی وە ئەوان کە بەندەکانن پرسیاریان لێدەکرێت لەبەرئەوەی ئەوان ژێردەستەو بەندەی خوان .

وە باوەڕبوون بە قەدەر پێویستە وە یەکێکە لە شەش پایەکەی باوەڕ لەبەر فەرمایشتی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم کەدەفەرمووێت :﴿ الإيمان أنْ تُؤْمِنَ بِاللهِ وَمَلاَئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ، وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ﴾ رواه مسلم وغيره.

﴿ باوەڕ بریتیە لەوەی باوەڕت بە خوا و فریشتەکان و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی سەلامی خوایان لێ بێت و ڕۆژی دوایی و قەزاو قەدەر بە خێرو شەڕیەوە هەبێت ﴾.

وە پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرمووێت :﴿ آمنْتُ بالقدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ، وَحُلْوِهِ وَمُرِّهِ ﴾.﴿ باوەڕم بە قەدەر هەیە بە خێرو شەڕو خۆشی و ناخۆشیەوە ﴾.

جا خێرو شەڕ بەرەچاوکردنی پاشهاتەکەیەتی وە خۆشی و ناخۆشیەکەی بەرەچاوکردنی کاتی تووشبوونەکەیەتی .

جا خێری قەدەر ئەوەیە کە بە سوود بێت وە شەڕەکەشی ئەوەیە کە زیان بەخش و ئازار بەخش بێت .

وە خێرو شەڕ بەگوێرەی ئەوەی ئەندازە بۆدانراو پاشهاتەکەیەتی چونکە هەیەتی خێرە وەکو ئەنجامدانی گوێڕایەڵی خوای گەورە وە تەندروستی وە دەوڵەمەندی وە هەشیەتی

کەشەڕە وە کو ئەنجامـدانی سەرپێـچیەکان و نەخۆشـی و هـەژاری و بـەڵام دەربـارەی کردەوەی خوایە ئەوا هەرگیز ناوترێت ئەوە شەڕە لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەری خـوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم لـەو نزایـەی کـە فێـری حەسـەنی کـوڕی عـەلی ڕەزای خوایان لێ بێت کە لە قنوتی وتردا بیخوێنێت ئەوە بوو کە دەیفەرموو : «وَقِنِـي شَـرَّ مَـا قَضَيْتَ» ﴿وە خوایەگیان بمپارێزە لەشەڕی ئەوەی بڕیارت لێ داوە﴾.

جاخوای پەروەردگار شەڕەکەی دایە پاڵ بڕیارلێدراوەکە نەك خودی بڕیارەکە.

## باوەڕ بە قەدەر نایەتەدی تەنها بەم چوار کارە نەبێت:

یەکەم : باوەڕ هێنان بەوەی کە خوای گەورە زانایە بە هەموو شتێك کەهەیە بچوك و گەورەی، کەم و زۆری بە زانیاریەکی پێش وەخت: لەبەر فەرموودەکەی خوای گەورە: ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ ۗ إِنَّ ذَٰلِكَ فِي كِتَابٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٧٠﴾﴾ الحج: ٧٠ واتە ﴿ئایە تۆ نەتزانیوە کە خوای گەورە هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدایە ئاگای لێیەتی و دەیزانێت، چونکە بەڕاستی هەموو ئەو شتانە لە ﴿لوح المحفوظ﴾ دا تۆمارکراوە، بێگومان ئەو کارەش بۆ خوا زۆر ئاسانە﴾.

دووەم : کە خوای گەورە لە ﴿ لوح المحفـوظ ﴾ دا ئەنـدازە گـیری هـەموو شـتێکی داناوە لـەبەر فەرموودەکەی خوای گـەورە : ﴿مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَا ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٢٢﴾﴾ الحدیـد: ٢٢ واتـە ﴿هـیچ بەڵاو نەهامەتیەك ڕوونادات نەلەزەویدا و نـە لـە خۆشـتاندا تووشـتان دەبێـت کـە لـە کتێبێکدا تۆمارمان نەکردبێت پـێش ئـەوەی ڕووداوەکـە بـەدیبهێنین ئـەو کـارەش لای خوای گەورە زۆر ئاسانە﴾ واتە هەرچی دروستکراوە ئێمە دروستی دەکەین .

وە لـەبـەر فەرموودەکـەی پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وعلـی آلـە وسـلم کـە دەفەرمووێت : ﴿إِنَّ اللَّهُ قَدَّرَ مَقَادِيرَ الْخَلاَئِقِ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ بِخَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ﴾[1]

---

[1] مسلم : کتاب القدر : باب حجاج آدم وموسى عليهما السلام ( ٢٦٥٣) ( ١٦) من حديث عبدالله بن عمرو بن العاص ولفظ ﴿كَتَبَ اللَّهُ مَقَادِيرَ الْخَلاَئِقِ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ بِخَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ﴾.

واتــە ﴿ بێگومـــان خـــوا ئەنـــدازەگیری بڕیـــاری هـــەموو ڕووداوو كاروبـــاری دروستكراوەكانی داوە پێش دروستكردنی ئاسمانەكان و زەوی بە پەنجا هەزار ساڵ ﴾.

سێیەم : هیچ شتێك لە ئاسمانەكان و زەویدا ڕوونادات تەنها بەویستو ئارەزووی خوا نەبێت كە لە نێوان بەزەیی و دانایی خوای گەورەدا دەخولێتـەوە بیـەوێت هەركەسێك ڕێنمویی بكات ئەوا بەبەزەیی خۆی ڕێنموییی دەكات، وە بیـەوێت هەركەسێك گـومڕا بكات ئەوا بە دانایی خۆی گومڕای دەكات، پرسیاری لێناكرێت دەربارەی هەر شـتێك كە بیكات لەبەر تەواویەتی دانـایی و دەسـتەڵاتی وە ئـەوان كـە بەنـدەكانن پرسـیاریان لێدەكرێت وەهەرچیەكیش ڕوویدابێت لـەوە ئـەوا دەقـاو دەقـە لەگـەڵ زانیـاری پـێش وەختیدا وە لەگەڵ ئەوەدا كەلە ﴿ لوح المحفوظ ﴾ دا نووسیویەتی لەبـەر فەرموودەكـەی خوای گەورە :﴿ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾ ﴾القمر: ٤٩ واتە ﴿ ئێمە هەموو شـتێكما بە ئەندازە بە دیهێناوە ﴾ .

وەهەروەها دەفەرموویت : ﴿ فَمَن يُرِدِ اللَّهُ أَن يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا ﴾ الأنعام: ١٢٥ واتـە ﴿ جائـەو كەسـەی خـوای گەورە بیەوێت ڕێنمویی بكات ئەوا سینەی ساف و پاك و ئامادە دەكات بـۆ وەرگرتنـی ئیسلام ئەو كەسەش خوای گەورە بیـەوێت گـومڕایی بكـات ئـەوا دڵـی دەگوشـێت و سینگی توند دەكات و هەناسەی سوار دەبێت ﴾.

جا خوای گەورە چەسپاندی كە ڕێنمـایی كـردن و گـومڕایی كـردن بـە ویـست و ئارەزووی خۆیەتی .

چوارەم : كە هەموو شتێك لە ئاسمانەكان و زەویدا دروستكراوی خوای گـەورەن و دروستكەرێكی تر پەروەردگارێكی تر جگە لەو نیە .

لەبـەر فەرموودەكـەی خـوای گـەورە : ﴿ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا ﴿٢﴾ ﴾ الفرقان: ٢

واتە ﴿ هەموو شتێكی لە نەبوونەوە بەدیهێناو ئەندازەگیری تەواویشی بۆ كرد ﴾ .

وە لەسـەر زاری ئیبراهیمـەوە دەفـەرموویت : ﴿ وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾ الصافات: ٩٦ واتە ﴿ وەخـوای گـەورە خـۆی ئێـوەی بـە دیهێنـاوە هـەروەها ئەوەشـی كەدەیكەن ﴾.

ولاَ نجعلُ قضاءَ اللهِ وقدَرَهُ حُجَّةً لنا في تَرْكِ أوامِرِهِ واجْتِنــاب نَوَاهِيــه، بـلْ يجبُ أنْ نُؤمِنَ ونَعْلَمَ أنَّ لله علينا الحُجَّةَ بإنزال الكتُب، وبَعْثَةِ الرُّسُلِ، قال اللهُ تعالى ﴿لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ﴾ النساء: ١٦٥

وە ئێمە قەزاو قەدەری خوا ناکەینە بەڵگە بـۆ خۆمـان لـە وازهێنـانی فەرمانـەکانی و دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکانی، بەڵکو پێویستە باوەڕمـان بـەوە بێـت کـە خـوای گـەورە بەڵگـەی لەسـەرمان دروسـتکردووە بـە دابەزانـدنی کتێبـەکانی وە بـەناردنی پێغەمبەرەکانی سەلامی خوایان لێ بێت .

خوای گەورە دەفەرمووێت : ﴿ تا دوای ئەو پێغەمبەرانە سەلامی خوایان لێ بێت هیچ بەڵگەو بیانوویەك بۆ ئەو خەڵکەیە نەمێنێ لەلای خوا ﴾.

**ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین**

**قەدەر بەڵگە نیە بۆ تاوانبار و سەرپێچیکار لەسەر کردنی تاوان و سەرپێچی :**

کردەوەکانی بەندەکان هەرهـەمووی لـە گوێڕایەڵیـەکان و سەرپێـچیەکان هـەمووی دروستکراوی خوان هەروەکو لە پێـشەوە باسـکرا بـەڵام ئـەوە بەڵگـە نیـە بـۆ کەسـی سەرپێچیکار تا بیکاتە بەڵگە لەسەر ئەنجامدانی تاوان و سەرپێچی ئـەوەش لەبـەر بـوونی بەڵگەی زۆر لەوانە:

١- خوای پەروەردگار کردەوەی بەندەی داوەتە پاڵ بەندەکـە خـۆیی و کردویەتیـە دەسـتکەوت بـۆی هەربۆیـە فەرموویـەتی : ﴿ٱلْيَوْمَ تُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ﴾ غافر: ١٧

واتە ﴿ لەو ڕۆژەدا هەرکـەس هەرچـی کـردووە پاداشـت و تۆڵـەی کـاری خـۆی دەبینێت﴾.

٢- خوای گەورە فەرمانی بە بەندە کردووە و قەدەغەشی لێکردووە وە شتێکی نەخستۆتە ئەستۆی کە بیکات تەنها ئەوە نەبێت کەلە توانایدایە لەبەرفەرمایشتی خۆی کەدەفەرموویت : ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ ﴾ البقرة: ٢٨٦

واتە ﴿ خوای گەورە بەدەر لەتوانا ئەرك ناخاتە سەر شانی هیچ کەس بەوەی ئەنجامی بدات ﴾

وەهەروەها دەفەرموویت : ﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ ﴾ التغابن: ١٦

واتە ﴿ ئەوەندەی دەتوانن تەقوای خواتان هەبێت و لێی بترسن ﴾.

جا ئەگەر زۆرلێکراو بووایە لەسەر کارکردن ئەوا نەیدەتوانی بە ئارەزووی خۆی نیش بکات یان دەستی لێهەڵبگرێت و نەیکات چونکە زۆرلێکراو ناتوانێت دەرباز بێت﴾.

٣- هەموو کەسێك باش دەزانێت جیاوازی چیە لە نێوان ئیشکردنی ئارەزومەندانەو زۆرەملێی وە ئەوەی یەکەمیان لەتوانایدا هەیە دەربازبێت لێی و نەیکات.

٤- کەسی تاوانبارو سەرپێچیکار پێش ئەوەی تاوانەکە ئەنجام بدان نازانێت چی لەبارەوە بڕیاردراوە وەهەر ئەو کەسە دەتوانێت کەئەو ئیشە بکات یان وازی لێ بێنێتو نەیکات ئیتر چۆن ڕێگەی هەڵە دەگرێتە بەرو قەدەرێکی نادیارو شاراوە دەکاتە بەڵگە نایە باشتر نیە کە ڕێگەی ڕاست و دروست بگرێتە بەرو بڵێت ئەوە ئەو شتەیە کە بڕیار بوو توشم ببێت و چارەنووسمە ؟ .

٥- خوای گەورە هەواڵی داوە لەبەرئەوە پێغەمبەرانی سەلامی خوایان لێ بێت ڕەوانە کردووە تا بیانووی بیانووگران ببڕێت .

﴿ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِۚ ﴾ النساء: ١٦٥

﴿ تا دوای ئەو پێغەمبەرانە سەلامی خوایان لێ بێت هیچ بەڵگەو بیانوویەك بۆ ئەو خەڵکەیە نەمێنێ لەلای خوا ﴾.

جائەگەر قەدەر بەڵگەبوایە بەدەستی کەسی سەرپێچیکارەوە ئەوا خوای گەورە ناردنی پێغەمبەرانی سەلامی خوایان لێ بێت نەدەکردە هۆکاری پچڕانی.

ونعلَمُ أنَّ اللهَ سبْحانه وتعالى ما أَمَرَ ونَهى إلاَّ المستطيعَ للفِعْلِ والتَّرْكِ، وأنَّه لم يُجْبِرْ أَحَدا على معصيةٍ، ولا اضْطَرَّهُ إلى تَرْكِ طَاعَةٍ.

وە دەزانين كە خوای پاك و بێگەرد فەرمانی بە هيچ شتێك نەكردووە و قەدەغەشی لە هيچ شتێك نەكردووە جگە لە شتێك نەبێ كە لە تواناداا هەيە بۆ كردن و وازلێهێنان، وەخوای گەورە هيچ كەسێكی ناچار نەكردووە لەسەر تاوانكردن. وەزۆريشی لێنەكردووە بۆ وازهێنان لە گوێڕايەڵی .

وقال الله تعالى ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَاۚ ﴾البقرة: ٢٨٦ واتە ﴿ خوای گەورە بەدەر لەتوانا ئەرك ناخاتە سەر شانی هيچ كەس بەوەی ئەنجامی بدات ﴾.

﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ ﴾ التغابن: ١٦ واتە ﴿ ئەوەندەی دەتوانن تەقوای خواتان هەبێت و لێی بترسن ﴾.

وقال تعالى ﴿ٱلْيَوْمَ تُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْۚ ﴾ غافر: ١٧ واتە ﴿ لەو ڕۆژەدا هەركەس هەرچی كردووە پاداشت و تۆڵەی كاری خۆی دەبينێت﴾.

فَدَلَّ على أنَّ للعبْدِ فِعْلًا وكَسْبًا يُجْزَى على حَسَنِهِ بالثَّوابِ، وعلى سَيِّئِهِ بالعِقابِ، وهو واقِعٌ بقضاءِ الله وقَدَرِه.

جا ئەوە بەڵگەيە لەسەر ئەوەی كە بەندە بۆی هەيە كار بكات و دەستكەوتی هەبێت پاداشت دەدرێتەوە لەسەر كردنی كاری باشە و سزاش دەدرێت لەسەر كردنی كاری خراپە .

## ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

**پێکهێنانی نێوان ﴿ التوفيق بين ﴾ ئەوەی کاری بەندە دروستکراوی خوایە لەلایەك و لە هەمانکاتیشدا دەستکەوتە بۆ بکەرەکەی :**

لەوەی کە ڕابورد بۆت دەرکەوت و زانیت کە کار و کردەوەی مرۆڤ دروستکراوی خوان وە ئەوەشت بۆ دەرکەوت کە دەستکەوتن بۆ مرۆڤەکە لەسەر باشەکان بە چاکە پاداشت دەدرێتەوە و لەسەر خراپەکەش بە سزا وەڵامی دەدرێتەوە جا ئێمە چۆن ئەو نێوانە ڕێکبخەین و لێی تێبگەین :

ڕێکخستنی نێوانیان بەوە دەبێت کە بزانین لە دوو ڕووە وە کردەوەی بەندە دروستکراوی خوایە ئەوانیش :

یەکەم : کردەوەی مرۆڤ لە سیفەتی مرۆڤە وە مرۆڤ و سیفەتەکانیشی دروستکراوی خوای گەورەن .

دووەم : کردەوەی مرۆڤ بەرهەمی ویستێکی دڵی و توانایەکی لاشەییە وەئەگەر ئەو دووانەش نەبوونایە ئەوا کردەوەش نەدەبوو وەئەوەشی کە ئەم ویست و توانایەی دروستکردووە بریتیە لە خوای گەورە، وەدروستکاری هۆ﴿ سبب﴾ دروستکاری هۆکارەکەیشە ﴿ مُسَبِبْ ﴾ جا خستنە پاڵی کرداری مرۆڤ بۆلای دروستکراوی خوا خستن پاڵی هۆکارە بۆلای هۆ نەك خستنە پاڵ و پەیوەندیەکی ڕاستەخۆ چونکە ڕاستەوخۆ خستنە پاڵی ڕاستەقینە بریتیە لە مرۆڤەکە هەرلەبەرئەوەش دەرئەنجام و دەستکەوتی ئیش و کارەکە دراوەتە پاڵی، وە دروستکردن و ئەندازە بۆدانانەکەیشی دراوەتە پاڵ خوا، جابۆ هەریەکێ لەو دوو درانە پاڵە بایەخی خۆی هەیە . والله أعلم.

ئەوانەی جیاوازن و مل بۆ هەق نادەن لــەبارەی قــەزا و قــەدەرەوە وە ڕەدی ئێمــەش بۆیان:

ئەوانەی مل بۆ هەق نادەن لە بارەی قەزا و قەدەرەوە دوو کۆمەڵ و گروپن :

کۆمەڵی یەکەم : جەبریەکانن دەڵێن مرۆڤ ناچارە لەسەر ئەوەی دەیکات و بەدەست خۆی نیە و هیچ خواست و هەڵبژاردنێکی بەدەست نیە لــەوەدا کــەدەیکات، وەئێمــەش ڕەدیان دەدەینەوە بە دوو ڕاستی :

١- خوای گەورە کردەوەی مرۆڤی داوەتە پاڵ مرۆڤەکە خۆی وە کردوویشەتی بــە دەستکەوت بۆی پاداشت و سزا وەردەگرێت بەگوێرەی ئەوەی ئــەنجامی داوە جائەگــەر زۆرلێکراو بووایەو هیچی بەدەست نەبووایە لەسەر ئەوەی دەیکات ئەوا ڕاست نەدەبوو درانەپاڵی کردەوە بۆلای وە سزادانیشی لەسەر ئەوەی دەیکات ستەم دەبوو.

٢- لەڕاستیدا هەموو کەسێك باش دەزانێت جیــاوازی چیــە لــە نێــوان ئیــشکردنی ئارەزوومەندانە و زۆرەملێیدا جائەگەر کەسێ دەست درێژی بکاتە سەر کەسێکی ترو وا دەربخات کەئەوەی کردوویەتی بەدەست خۆی نــەبووە چــونکە زۆری لێکــراوە لەســەر ئــەوەی ئــەو کــارە بکــات بەقــەزاو قــەدەری خــوا کردوویــەتی ئائــەوە بــە بــێ ئــەقڵی دەژمێردرێت و پێچەوانەی ئەو شــتەیە لــەناو خەڵکــدا زانــراوە و مرۆڤــەکانی لەســەر ڕاهاتوون .

کۆمەڵی دووەم : قەدەریەکانن دەڵێن مرۆڤەکان ســەربەخۆن لــەوەی دەیکــەن هــیچ پەیوەندییەکی بــە خــواوە نیــە نــە ویــستی و نــە توانــایی خــوای لەســەرە و نــە خــواش دروستیکردووە، وەئێمەش ڕەدیان دەدەینەوە بە دوو ڕاستی :

١- ئەو قسەیە پێچەوانەی فەرموودەی خوای گەورەیە :﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ ﴾ الزمر: ٦٢ واتە ﴿ خوای گەورە دروستکاری هەموو شتێکە ﴾.

وە هەروەها ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾ الصافات: ٩٦ واتە ﴿ وەخوای گەورە خۆی ئێوەی بە دیهێناوە هەروەها ئەوەشی کەدەیکەن ﴾.

٢- خوای گەورە خاوەنی ئاسمانەکان و زەوییە جاچۆن دەبێت لەناو موڵکەکەیدا شتێك هەبێت پەیوەندی بە ویستی ئەوە وە نەبێت و ئەو دروستی نەکردبێت ؟

*********

## ﴿ جۆرەکانی ویست و جیاوازی نێوانیان ﴾

ویستی خوای گەورە دابەش دەبێت بە دووبەشەوە : کەونی و شەرعی :

**قەدەری کەونی** : بریتیە لەوەی کە بە مانای ویست و ئارەزوو دێت هەروەکو خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿ فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ ۖ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُۥ يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا ﴾ الأنعام: ١٢٥ واتە ﴿ جائەو کەسەی خوای گەورە بیەوێت ڕێنموویی بکات ئەوا سینەی ساف و پاك و ئامادە دەکات بۆ وەرگرتنی ئیسلام ئەو کەسەش خوای گەورە بیەوێت گومڕایی بکات ئەوا دڵی دەگوشێت و سینگی توند دەکات و هەناسەی سوار دەبێت ﴾.

**قەدەری شەرعی** :بریتیە لەوەی کە بە مانای پێخۆشبوون ﴿ خۆشەویستی ﴾ دێت هەروەکو خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿ وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيْكُمْ ﴾ النساء: ٢٧

واتە ﴿ خوای گەورە دەیەوێت و پێیخۆشە لێتان خۆش بێت ﴾.

وە جیاوازی نێوانیان بریتیە لەوەی کە کەونیەکە دەبێت ئەوەی دەیەوێت ڕووبدات و مەرج نیە ئەوەی ڕوودەدات خوا پێیخۆش بێت بەڵام شەرعیەکە پێویستە ئەوەی خوا دەیەوێت ڕووبدات پێیخۆش بێت و مەرجیش نیە ڕووبدات .

ڕوونكردنەوەى وەرگێڕ : خوێنەرى بەڕێز پێويستە بەباشى لەو ياسايەى سەرەوە تێبگەيت جابۆئەوەى تێبگەيت بەنموونەيەك بۆت ڕوون دەكەمەوە :

بۆ قەدەرە كەونيەكە : خواى گەورە ويستى لەسەرە كوشتن و زينا و دزى دروستبكات بۆ ئەوەى بەندەكانى خۆى پىٚ تاقيبكاتەوە بەڵام هەرگيز پێيخۆش نيە كە بەندەكانى هەڵسن بە ئەنجامدانى ئەو كارانە واتە حەز ناكات بەندەكانى بكوژبن يان زيناكاربن يان دز بن دروستكردنى ئەو بۆ ئەو كردارانە بۆ تاقيكردنەوەيەو هيچى تر .

بۆ قەدەرە شەرعيەكە : خواى گەورە پێيخۆشە هەموو بەندەكانى يەكخواناس بن و پەرستش بۆ ئەو ئەنجامبدەن بەڵام ئايە مرۆڤەكان هەموويان يەكخواناس و پەرستشى بۆ دەكەن لە وەڵامدا دەڵێين نەخێر چونكە زۆربەى مرۆڤەكان هاوبەش بۆ خوا دادەنێن و پەرستشەكان بۆ جگە لەخوا ئەنجام دەدەن وەكو نوێژو سوژدەو سەبڕين و هانابردن و داواليێكردن و خۆشەويستى و ڕق و ئەوانەى تريش، كەواتە بۆمان دەركەوت جياوازى هەيە لە نێوان قەدەرى كەونى و شەرعيدا و پێويستى ئێمەش تێكەڵاوى نەكەين تا گومڕا نەبين ﴿ وەرگێڕ ﴾.

**الإيمان قولٌ وَعَمَلٌ**

**باوەڕ وتەو کردارە**

**والإيمانُ قَوْلٌ باللسانِ وعمَلٌ بالأرْكانِ وعَقْدٌ بالجَنَانِ، يزيـدُ بالطاعـةِ ويـنْقُصُ بالعصيانِ.**

**باوەڕ بریتە لە ووتن بە زوبان وە کردەوەکـردن بـە ئەندامـەکانی لاشـە وە بـاوەڕپێ بوون بە دڵ، بە گوێڕایەڵی کردن زیاد دەکات و بە سەرپێچیکردنیش کەم دەکات .**

**خـــوای گـــەورە دەفـــەرموویّت : ﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ﴿٥﴾ ﴾ البينة: ٥**

**واتە ﴿ وە ئەوان هیچ فەرمانێکیان پێنەکرابوو تەنها ئەوە نەبێت کەوا بەندایەتی خوای گەورە بکەن و بەڕاستی و پاکی وئاین پەروەری بۆ ئەو بکەن و لە هەمووئاین ڕێبـازێکی تر لادەن بۆ تاکە ڕێگای ئیـسلام وە بـەڕێکو پێکـی هەڵـسن بـەکردنی نوێـژەکانیان وە زەکاتی ماڵ و سامانەکانیان بدەن هەر ئەوەش ئاینی ڕاستەقینەی خوای گەورەیە ﴾ .**

**جا خوای گەورە پەستنی خوای گـەورە و نیازپـاکی دڵ و هەسـتان بـەکردنی نوێـژو دانی زەکات هەرهەمووی بە دین باسکرد .**

**وقالَ رسولُ اللهِ– صلى الله عليه وسلم –«الإيمَـانُ بِـضْعٌ وَسَـبْعُونَ شُـعْبَةً, أَعْلاَهَا شَهَادَةُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاّ الله, وَأَدْنَاهَا إِمَاطَةُ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ».**

واتە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلى آله وسلم دەفەرموویت : ﴿ باوەڕ حەفتاو ئەوەندە بەشە بەرزترینی شایەتی دانە بەوەی هیچ پەرستراوێك نیە شایەنی پەرستن بێت بە هەق جگە لە الله نەبێت وە نزمترینیشی لادانی نارەحەتیە لەسەر ڕێگە ﴾.

فجعَلَ القَوْلَ والعَمَلَ مِنَ الإيمانِ .

جا خوای گەورە گوفتارو کرداری بەبەشێك لە باوەڕ دانا.

وە خوای گەورە دەفەرموویت :﴿فَزَادَتْهُمْ إِيمَـٰنًا ﴾التوبة: ١٢٤ واتە ﴿جا خوای گەورە ئیمان و باوەڕیان زیاد دەکات ﴾.

وەهەروەها دەفەرموویت : ﴿لِيَزْدَادُوٓاْ إِيمَـٰنًا مَّعَ إِيمَـٰنِهِمْ ﴾الفتح: ٤واتە ﴿ بۆ ئەوەی بڕوایان زیاد بکات لەگەڵ بڕواکەیاندا ﴾.

وقال رسولُ الله– صلى الله عليه وسلم ﴿يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ مَنْ قَالَ لاَ إِلـهَ إلاَّ الله وَفِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ بُرَّةٍ أَوْ خَرْدَلَةٍ أَوْ ذَرَّةٍ مِنَ الإيمانِ﴾ فجعَلَهُ متفاضلاً.

واتە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلى آله وسلم دەفەرموویت : ﴿ هەرکەسێك بڵێت لاَ إِلـهَ إلاَّ الله و بەئەندازەی دەنکە گەنمێك یان تۆوە خەرتەلەیەك یان گەردیلەیەك باوەڕی تێدا بێت لەئاگری دۆزەخ دێتە دەرەوە ﴾ جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلى آله وسلم باوەڕی پلە بەندکرد و بەش بەشی کرد.

## ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

## ﴿ باوەڕ ﴾

باوەڕ لەزمانەوانیدا : بریتیە لە بەڕاست دانان .

وەلەزاراوەی زانایاندا : بریتیە لە گوفتـار و وتـە بـە زوبـان وە کـردەوە کـردن بـە ئەندامەکانی جەستە وە باوەڕبوون بە دڵ .

نمونەی وتە و گوفتار : لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله .

وە نمونەی کردار و کردەوە : ڕکوع – چەمینەوە .

وەنمونەی ﴿ عقد – گرێبەستنی دڵ ﴾ : باوەڕبوون بـە خـوا و فریـشتەکانی و جگـە لەوانەش لەوانەی پێویستە باوەڕ بوون پێی .

وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە ئەوە باوەڕە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ﴾ البينة: ٥

واتە ﴿ وە ئەوان هیچ فەرمانێکیان پێنەکرابوو تەنها ئەوە نەبێت کەوا بەندایەتی خوای گەورە بکەەن و بەڕاستی و پاکی وئاین پەروەری بۆ ئەو بکەن و لـە هەمووئاین ڕێبازێکی تر لادەن بۆ تاکە ڕێگای ئیـسلام وە بـەڕێکو پێکـی هەڵـسن بـەکردنی نوێـژەکانیان وە زەکاتی ماڵ و سامانەکانیان بدەن هەر ئەوەش ئاینی ڕاستەقینەی خوای گەورەیە ﴾ .

جا هەرکام لە نیازپاکی و نوێژو زەکاتی بەبەشێك لە دین دانا.

وە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آلـه وسـلم دەفـەرموێت : ﴿الإِيْمَـانُ بِـضْعٌ وَسَبْعُونَ شُعْبَةً, أَعْلاَهَا شَهَادَةُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاّ الله, وَأَدْنَاهَا إِمَاطَةُ الأَذَى عَـنِ الطَّرِيـقِ﴾.رواه

مسلم، وه بەم شێوەیەش ﴿ فافضَلُها قولُ لاَ إِلَهَ إلاّ الله ﴾ وه ئەصـلی ئـەم فەرموودەیـە لەهەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدایە [1].

واتە ﴿ باوەڕ حەفتاو ئەوەندە بەشە بەرزترینی شایەتی دانە بـەوەی هـیچ پەرسـتراوێك نیە شایەنی پەرستن بێت بە هەق جگە لــە الله نـەبێت وە نزمترینیـشی لادانـی نارەحەتیـە لەسەر ڕێگە ﴾.

وە باوەڕ زیادەكات بە گوێڕایەڵیكردنی خوای گەورە و كەمیش دەكات بە سەرپێچی كردنی .

وە خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ فَزَادَتْهُمْ إِيمَـٰنًا ﴾التوبـة: ١٢٤ واتـە ﴿جـا خـوای گەورە ئیمان و باوەڕیان زیاد دەكات ﴾.

وەهەروەها دەفەرموێت : ﴿ لِيَزْدَادُوٓاْ إِيمَـٰنًا مَّعَ إِيمَـٰنِهِمْ ﴾ الفتح: ٤واتە ﴿ بـۆ ئـەوەی بڕوایان زیاد بكات لەگەڵ بڕواكەیاندا ﴾.

وە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم دەفەرموێت : ﴿يَخْرُجُ مِـنَ النَّـارِ مَنْ قَالَ لاَ إِلهَ إِلاَّ الله وَفِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ بُرَّةٍ أَوْ خَرْدَلَةٍ أَوْ ذَرَّةٍ مِنَ الإيمانِ﴾ رواه البخاري[2].

---

١ مسلم : كتاب : الإيمان : باب بيان عدد شعب الإيمان وأفضاها وأدناها .. ﴿ ٣٥ ﴾ ﴿ ٥٨﴾ من حديث أبي هريرة رضي الله عنه .

وهو عند البخاري : كتاب الإيمان : باب أمور الإيمان ﴿ ٩﴾ مختصراً بلفظ : ﴿الْإِيمَـانُ بِـضْعٌ وَسِـتُّونَ شُعْبَةً وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنْ الْإِيمَانِ ﴾ .

٢ البخاري : كتاب الإيمان : باب زيادة الإيمان ونقصانه ﴿ ٤٤﴾.

ومسلم : كتاب الإيمان : باب أني أهل الجنة منزلة ﴿ ١٩٣﴾ ﴿ ٣٢٥﴾ من حديث أنس بـن مالـك رضي الله عنه.

واتە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم دەفەرمووێت : ﴿ هەركەسێك بلێت لاَ إِلـهَ إلاَّ الله و بەئەندازەی دەنكە گەنمێك یان تۆوە خەرتەلەیەك یان گەردیلەیەك باوەڕی تێدا بێت لەئاگری دۆزەخ دێتە دەرەوە ﴾ جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم باوەڕی پلە پلە و بەش بەشی كرد.

جائەگەر زیاد بوونە باوەڕ چەسپا كەم بوونیشی دەچەسپێت چونكە ﴿ من لازم الزیادة أن یكون المزید علیه ناقصاً عن الزائد ﴾ ﴿ هەرشتێك پەیوەست بێت بە زۆریەوە ئەوا دەبێت ئەوەی زۆركراوە و خراوەتە سەری كەمتر بێت لە زۆرەكە ﴾.

باوەڕ بوون بەهەموو ئەوانەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم هەواڵی لەبارەوە داوە

ويجبُ الإيمانُ بكلِّ مَا أَخبَرَ به النبيُّ – صلى الله عليه وسلم – وصَحَّ به النَّقلُ عَنْه فيما شَاهَدْناه أو غابَ عَنّا نَعْلَمُ أنَّه حَقٌّ وصِدقٌ، وسواءٌ في ذلك ما عقَلْناهُ وجَهلناهُ، ولم نَطَّلِعْ على حقيقةِ معناهُ، مِثْلَ حديثِ الإسْراءِ والمِعراجِ[1] وكان يَقَظَةً لا مَنامًا، فإنَّ قُرَيْشًا أنْكَرَتْهُ وأَكْبَرَتْهُ ولم تُنْكِرُ المنامات.

واتە ﴿ وە پێویستە باوەڕهێنان بە هەموو ئەو شتانەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم هەواڵی لەبارەوە داوە وەئەوەی بەڕاستی لێوەی گێڕدراوەتەوە لەوەی بینومانە یان لای ئێمە نادیارە و دەزانین کەئەوە هەق و ڕاستە، وەیەکسانیشە لەوەدا ئەوەی ماناکەی دەزانین یان واتاکەی لای ئێمە نەزانراوە و نەگەیشتووین بەواتا ڕاستەقینەکەی، نمونەی فەرموودەی ئیسراو میعراج وە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم لەو ڕووداوەدا بەخەبەر بووە و نووستوو نەبووە چونکە قورەیشیەکان باوەڕیان پێنەکرد و بە شتێکی گەورەیان زانی کە ناکرێت باوەڕی پێبکرێت وەهەرئەوانە ئینکاری خەویان نەدەکرد .

ومِنْ ذلك أنَّ ملَكَ الموْتِ لَمَّا جاءَ إلى موسى عليه السلامُ لِيَقْبِضَ روحَهُ لَطَمَهُ فَفقَأَ عَيْنَهُ، فَرَجَعَ إلى ربِّهِ فَرَدَّ عَلَيْهِ عَيْنَهُ.

وەلەو هەواڵانەش ئەوەی کە فریشتەی ڕۆح کێشان کاتێك هات بۆ لای پێغەمبەر موسى عليه السلامُ بۆ ئەوەی ڕۆحی بکێشێ زللەیکی لێدا چاوی کوێرکرد، جا دوای ئەوە گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری چاوی بۆ چاککردەوە .

---

[1] البخاري : ( ٣٢٠٧) ( ٣٨٨٧) ومسلم ( ١٦٤) ( ٢٦٤) من حديث أنس بن مالك رضي الله عنه عن مالك بن صعصعة .

وراجع الآية الكبرى في شرح قصة الإسراء للسيوطي . ونور المسري لأبي شامة . والإسراء والمعراج لأبي شهبة .

## ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

**السمعيات : بیستراوەکان:**

السمعيات : بیستراوەکان: هەموو ئەو شتانەیە کە جێگیر بووە بەڕێگەی بیستراو واتە لەڕێگەی شەرعەوە سەلمێنرابێت وە عەقڵیش هیچ جۆرە دەست تێوەردانێکی تێدا نەبێت وە هەموو ئەو شتانەی کە سەلمێنراوە لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وعلى آله وسلم لەو هەواڵانەی داویەتی چونکە ئەوە هەقە پێویستە بەڕاست بزانرێت ئیتر ئەو هەواڵەی کە داویوتی بینیبێتمان بە ئەندامە هەستیارەکانمان ﴿ چاو ﴾ یان شاراوە بێت لامان وە یان شارەزای بوو بێتین و واتاکەیمان زانیبێت بە عەقڵەکانمان یان ماناکەی نەزانین لەبەرفەرمایشتی خوای گەورە کەدەفەرمووێت : ﴿ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ۖ وَلَا تُسْـَٔلُ عَنْ أَصْحَٰبِ ٱلْجَحِيمِ ﴿١١٩﴾ ﴾ البقرة: ١١٩ واتە ﴿ ئێمە تۆمان بەڕاست و ڕەوان نارد ئەی محمد صلى الله عليه وعلى آله وسلم کە مژدە بە خەڵکانی ئیماندار و ئاکار چاك بدەیت خەڵکی کافرو بێ باوەڕیش لە توڕەیی خوا بترسێنیت و ئیتر پاش ئەوە دەربارەی دۆزەخیەکان تۆ بەرپرسنیت ﴾.

وە بێگومان دانەر کۆمەڵە شتێکی باسکردووە لەوانە:

<u>**باسی یەکەم**</u> : ﴿الإسراء والمعرج – شەوڕەوی و بەرزبوونەوە﴾

الإسراء : لەزمانەوانیدا شەوڕەویکردن بەکەسێك، وەووتراوە بەواتای شەوڕۆیی دێت.

وەلەشەرعیشدا : بردنی پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وعلى آله وسلم لەلایەن جوبرەئیلەوە لەمەکەوە بۆ قودس لەبەر فەرمایشتی خوای گەورە کەدەفەرمووێت : ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ﴾الإسراء: ١

واتە ﴿ پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە شەو ڕەوی بەبەندەی خـۆی محمـد صـلی الله علیه وعلى آله وسلم کرد لەبەشێکی زۆر کەمی شەودا لە مزگـەوتی حەرامـەوە لـە مەککە بۆ مزگەوتی ئەقصا لەشاری قودس لە وولّاتی فەلّستین ﴾.

والمراج : لەزمانەوانیدا : بریتیە لـەو ئـامێرەی بەهۆیـەوە بەرزدەکرێتـەوە کەئـەویش بەرزکەرەوەیە .

وەلەشەرعیشدا :بریتیە لەو پەیژەیەی کەبە هۆیەوەی پێغەمبەری خوایان صلی الله علیه وعلى آله وسلم پیّ بەرزکردەوە لە زەوییەوە بۆ ئاسمان لەبەر فەرمایشتی خـوای گـەورە کەدەفەرمووێت : ﴿وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ (١) مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمۡ وَمَا غَوَىٰ (٢)﴾ النجم: ١ – ٢

واتـە ﴿ سـوێند بـەو ئەسـتێرەیەی کەبـەخێرایی ئاوادەبێـت یـان لـە شـوێنی خـۆی دەترازێت‌و بەر دەبێتەوە کاتی نزیکبوونەوەی قیامەت هاوەڵکـەی ئێـوە محمـد صـلی الله علیه وعلى آله وسلم لە ڕێی هەق لاینەداوە و باوەڕی پووچیشی نەبووە ﴾.

تائەو شـوێنەی کەدەفـەرمووێت ﴿ لَقَدۡ رَأَىٰ مِنۡ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلۡكُبۡرَىٰٓ (١٨)﴾ النجم: ١٨
واتە﴿ بەڕاستی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلى آله وسلم گەلێك بەڵگەو نیـشانەی گەورە گـەورەی پـەروەردگاری خـۆی لەسـەفەرەکەیدا وەك ﴿ سـدرة المنتهـی ، بیـت المعمور، بەهەشت و دۆزەخ....هتد﴾ بینی .

وە هەردووکیان ﴿الإسراو والمعرج ﴾ لەیـەك شـەو دا بـووە لای زۆربـەی زانایـان، وەزانایان جیاوازیان هەیە لە نێواندا کەی بووە جا دەگێڕدرێتەوە بە ڕشتەیەکی پچڕاو لە ئیبن و عەباس و جابرەوە ڕەزای خـوا لــە هـەموویان بێـت کـە ﴿ لەشـەوی دووشـەممە دوانزەی ڕەبیعی یەکەمدا بووە ﴾ وە ساڵەکەیان دیاری نەکردووە . ئیبن و ئـەبی شـەیبە ئەم فەرموودەیەی ڕیوایەتکردووە .

دەگێڕدرێتەوە لە زوهری و عوروە وە کە ووتویانــە ئـەو ڕووداوە پـێش کۆچـکردن بووە بە سالێك بەیهەقی ئـەم فەرموودەیـەی ڕیوایـەتکردووە . جـا دەبێـت لـە ڕەبیعـی یەکەمدا بێت و شەوەکەیان دیاری نەکردووە، وەئیبن و سەعدیش هـەمان شـتی ووتـوە، وەپێشەوا نەوەویش ئەوەی بەتەواو و ڕاست داناوە .

دەگێڕدرێتەوە لە سودییەوە کە ووتویـەتی ئـەو ڕووداوە پـێش کۆچـکردن بـووە بـە شەشانزە مانگ واتە سالێك و شەش مانگ پێشەوا حـاکم ڕیوایـەتی کـردووە جابـەپێی ئەوە بێت لـە مانگی ذي القعدە دا بووە وە ووتراویشە پـێش کۆچـکردن بـووە بـە سـێ مانگ وە ووتراوە بە پێنج مانگ ووتراوە بە شەش مانگ.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیـه وعلـی آلـه وسـلم لـەو ڕووداوەدا بەخەبـەر بـووە و نووستو خەوتوو نەبووە چونکە قورەیش باوەڕیان پێنەکرد و بە شتێکی گـەورەیان زانـی کە ناکرێت بـاوەڕی پێبکرێـت وە ئەگـەر خـەوتوو بوایـە ئینکاریـان نـەدەکرد چـونکە هەرئەوانە ئینکاری خەویان نەدەکرد .

چیرۆکەکەی بەم شێوەیە بووە : کە خـوای گـەورە فـەرمانی بـە جوبرەئیـل سـەلامی خوای لێ بێت کردووە کە شەو ڕەوی بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم

بکات بۆ مزگەوتی ئەقصا لەسەر بوراق پاشان بەرزکرایەوە بۆ ئاسمانەبەرزەکان ئاسمان ئاسمان تاگەیشتە شوێنێك تیایدا گوێی لە دەنگی پێنووسەکان بوو وە خوای گەورە پێنج نوێژەکەی لەسەر پێویست کرد وە بەهەشـت و دۆزەخـی بینـی وە پەیوەنـدی کـرد بـە پێغەمبەرە بەڕێزەکانەوە سەلامی خوایان لێ بێت وە نوێژی پێکردن بە پێـشەوایەتی خـۆی پاشان گەڕایەوە بۆ مەککە جا لەبارەی ئەوەی بینیبووی قسەی بۆ خـەڵکی کـرد ئـەوجا بێباوەڕان بەدرۆیان خستەوە و باوەڕدارانیش بەڕاستیان زانی و هەنـدێکی تـریش دوودڵ بوون و لەو نێوەندەدا بوون.

واتە ﴿ جا بانگ دەرێك لەئاسمانەوە بانگ دەكات كەوا بەندەكەم ڕاستی كرد. جێگای لەبەهەشتەوە بۆڕاخەن، وەجل و بەرگی لەبەهەشتەوە بكەنە بەر، وەدەرگایەكی بۆبكەنەوە بەرەوبەهەشت، فەرمووی جا لەباو بۆنی خۆشی بەهەشتی بۆدێت. وەگۆڕەكەی بۆ فراوان دەكەنەوە چەند چاوی بڕبكات ﴾ وەلەبارەی مرۆڤی بێباوەڕەوە دەفەرمووێت ﴿ جا بانگ دەرێك لەئاسمانەوە بانگ دەكات كەوا بەندەكەم درۆی كرد جێگایەكی لە ئاگر بۆ ڕابخەن، وەدەرگایەكی بۆ بكەنەوە بەرەو دۆزەخ، جالەگەرمی و ناخۆشی دۆزەخی بۆدێت، وەگۆڕەكەی لەسەر تەنگ دەبێتەوە و دێتەوە یەك تاپەراسوەكانی دەچنەوە بەناو یەكدا ﴾ ئەم فەرموودەیە پێشەوایان ئەحمەد و ئەبو داود ڕیوایەتیان كردووە .

وەبێگومان پێشین هەموو یەكدەنگن وە هەروەها ئەهلی سوننەش یەكدەنگن لەسەر سەلماندن و جێگیركردنی سزای و خۆشی ناو گۆڕ ئین و لقەیم لە پەرتووكی ڕوحدا باسیكردووە، وە بێباوەڕەكان باوەڕیان بە سزای ناوگۆڕنیە بەبیانووی ئەوەی ئەگەر بێت

---

فَيَقُولُ أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْخَبِيثَةُ اخْرُجِي إِلَى سَخَطٍ مِنْ اللَّهِ وَغَضَبٍ قَالَ فَتُفَرَّقُ فِي جَسَدِهِ فَيَنْتَزِعُهَا كَمَا يُنْتَزَعُ السَّفُّودُ مِنْ الصُّوفِ الْمَبْلُولِ فَيَأْخُذُهَا فَإِذَا أَخَذَهَا لَمْ يَدَعُوهَا فِي يَدِهِ طَرْفَةَ عَيْنٍ حَتَّى يَجْعَلُوهَا فِي تِلْكَ الْمُسُوحِ وَيَخْرُجُ مِنْهَا كَأَنْتَنِ رِيحِ جِيفَةٍ وُجِدَتْ عَلَى وَجْهِ الْأَرْضِ فَيَصْعَدُونَ بِهَا فَلَا يَمُرُّونَ بِهَا عَلَى مَلَإٍ مِنْ الْمَلَائِكَةِ إِلَّا قَالُوا مَا هَذَا الرُّوحُ الْخَبِيثُ فَيَقُولُونَ فُلَانُ بْنُ فُلَانٍ بِأَقْبَحِ أَسْمَائِهِ الَّتِي كَانَ يُسَمَّى بِهَا فِي الدُّنْيَا حَتَّى يُنْتَهَى بِهِ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا فَيُسْتَفْتَحُ لَهُ فَلَا يُفْتَحُ لَهُ ثُمَّ قَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ { لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ وَلَا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ } فَيَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ اكْتُبُوا كِتَابَهُ فِي سِجِّينٍ فِي الْأَرْضِ السُّفْلَى فَتُطْرَحُ رُوحُهُ طَرْحًا ثُمَّ قَرَأَ { وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنْ السَّمَاءِ فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ } فَتُعَادُ رُوحُهُ فِي جَسَدِهِ وَيَأْتِيهِ مَلَكَانِ فَيُجْلِسَانِهِ فَيَقُولَانِ لَهُ مَنْ رَبُّكَ فَيَقُولُ هَاهْ هَاهْ لَا أَدْرِي فَيَقُولَانِ لَهُ مَا دِينُكَ فَيَقُولُ هَاهْ هَاهْ لَا أَدْرِي فَيَقُولَانِ لَهُ مَا هَذَا الرَّجُلُ الَّذِي بُعِثَ فِيكُمْ فَيَقُولُ هَاهْ هَاهْ لَا أَدْرِي فَيُنَادِي مُنَادٍ مِنْ السَّمَاءِ أَنْ كَذَبَ فَافْرِشُوا
لَهُ مِنْ النَّارِ وَافْتَحُوا لَهُ بَابًا إِلَى النَّارِ فَيَأْتِيهِ مِنْ حَرِّهَا وَسَمُومِهَا وَيُضَيَّقُ عَلَيْهِ قَبْرُهُ حَتَّى تَخْتَلِفَ فِيهِ أَضْلَاعُهُ وَيَأْتِيهِ رَجُلٌ قَبِيحُ الْوَجْهِ قَبِيحُ الثِّيَابِ مُنْتِنُ الرِّيحِ فَيَقُولُ أَبْشِرْ بِالَّذِي يَسُوءُكَ هَذَا يَوْمُكَ الَّذِي كُنْتَ تُوعَدُ فَيَقُولُ مَنْ أَنْتَ فَوَجْهُكَ الْوَجْهُ يَجِيءُ بِالشَّرِّ فَيَقُولُ أَنَا عَمَلُكَ الْخَبِيثُ فَيَقُولُ رَبِّ لَا تُقِمْ السَّاعَةَ ﴾ ﴿وەرگێڕ﴾.

ئێمە گۆڕەکان هەڵبدەینەوە ئەوا دەبینین مردووەکە هەر وەکو خۆیەتی و هیچ گۆڕنکاری بەسەردا نەهاتووە، وەئێمەش بە دوو ڕاستی وەڵامیان دەدەینەوە :

١- بوونی بەڵگە لەسەری لە قورئان و سوننەت و یەکدەنگی پێشین لەسەر ئەو بابەتە ﴿بەڕاستی تەنها ئەمە بەسە بۆ کەسێ ژیری لەدەست نەدابێت و لەڕیزی مرۆڤدا مابێت چونکە پێویستە مرۆڤ باوەڕ بەو خوایە بکات کەدروستی کردووە و باش دەزانێت چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکات و سەرئەنجامی بۆکوێ بەرێت، ئەرێ بۆچی ئەگەر کەسێك ئامێرێك دروست بکات و بەو شێوەیەی ئەو دەیەوێت ئیش نەکات ئەوا بەئارەزووی خۆی هەڵیدەوەشێنێتەوە و لەت و کوتی دەکات خۆ کەسێکیش پێی بڵێ بۆ وا لەو ئامێرە دەکەیت ؟ لەوەڵامدا دەڵێت خۆم دروستم کردووە و خۆیشم دەزانم چی لێدەکەم، دەی خوا شایستە تر نیە بەوەی بە ویستی خۆی و دادگەریە جوانەکەی سزای ئەوانە بدات سەرپێچی دەکەن سەرکێشن بۆ ئەنجامدانی ئەو هەموو تاوانە گەورانەی بە چاوی خۆمان دەیبینین کە بێباوەڕان و تاوانباران بەم ڕۆژگارە ئەنجامی دەدەن وادەزانن ئەم دونیایە هەرئاوا ڕۆشن و فراوانە نەخێر والله تاریکی و تەسکی گۆڕ ئەمانەت هەمووی لەبیردەباتەوەو وانەیەکیشت دادەدات کەهەرگیز پەشیمانی دادت نەدات ئەوا ئامۆژگاریمان کردیتت بزانین دەیبیستیت، دەی کەوایە ئەی مرۆڤی ژیر بۆ هۆشت ناهێنیتەوە بەر خۆت تاواز لەکەلە ڕەقی بێنیت و خۆت لەڕیزی مرۆڤەکان دەرنەکەیت ئەوە ڕاستیە هەردەبێت باوەڕت پێی بێت ئەگەر نا ئەوە بەچاوی خۆت دەیبینیت چیت بەسەر دێت ئێمە تەنها بیرخستنەوەمان لەسەرە – وەرگێڕ ﴾.

٢- ڕاستیەکی تر ئەوەیە بارودۆخی ژیانەکەی تر پێوانە ناکرێتە سەر بارودۆخی ژیانی دونیا چونکە سزا یان خۆشی لەناو گۆڕدا وەکو هەسپێکراوەکانی دونیا نیە .

**********************

## ئایە سزای ناو گۆڕ یان خۆشی ناو گۆڕ لەسەر ڕۆحەکەیە یان لەسەر لاشەکەیە بەواتایەکی تر ئایە کامیان دەیچێژن ؟

شێخی ئیسلام ئیبن و تەیمیە ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت : ﴿ ڕێگەو ڕێبازی پێشینی ئوممەت و پێشەواکانی لەسەر ئەوەیە کە سزا و خۆشی ڕۆح و لاشەی مردووەکە دەگرێتەوە، وەلەسەرئەوەن کە ڕۆح لەدوای ئەوەی لە لاشە جیادەبیتەوە خۆشی و سزا دەچێژێت وە هەندێ جار دەچێتەوە ناو لاشەو لەگەڵیدا خۆشی دەبینی یان سزا دەرێت﴾.

## ﴿ فوكردن بە صور – كەڕەنادا ﴾

فوكردن زانراوە، وە صوریش لەزمانەوانیدا بریتیە لە شاخی گیاندار، وەلەلای زانایانیش شاخێكی گەورەیە ئیسرافیل ناویەتی بەدەمیەوە چاوەڕێیە كەی فەرمانی پێبكرێت فوی پێدا بكات، وەئیسرافیلیش یەكێكە لە فریشتە بەرێزەكان ئەوانەی عەرشی خوای گەورە هەڵدەگرن، كەئەوەش دوو فووە یەكێكیان فووی تۆقاندنە ئیسرافیل فوی پێدادەكات جاخەڵكی دەتۆقن و بێ ئاگاو شپرزە دەبن جگە لەوانە نەبێت كەخوای گەورە خۆی دەیەوێت، وەدووەمیان فوی زیندووكردنەوەیە ئیسرافیل فوی پێدادەكات جاخەڵكی زیندوو دەبنەوە و هەڵدەستنەوە لە گۆڕەكانیان .

وەبێگومان بەڵگە هاتووە لەسەر فوكردن بە كەڕەنادا لە قورئان و سوننەت و یەكدەنگی ئوممەت .

خوای گەورە دەفەرمووێت : ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾﴾ الزمر: ٦٨

واتە ﴿ لەو ڕۆژەدا فوو دەكرێت بەكەڕەنادا جا هەرچ لەئاسمانەكان و هەرچیش لەزەویدا مابێت خێرا دەمرن مەگەر كەسێك خوا خۆی نەیەوێت نەمرێت پاشان بۆ جارێكی تر كە فووی پیاكرا ئەوجا لەناكاو تەواوی دروستكراوەكان لە گۆڕەكانیاندا هەڵئەسنەوە و چاوەڕوانن چیان پێبكرێت ﴾

وەهەروەها دەفەرمووێت : ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلْأَجْدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ ﴿٥١﴾﴾ یس: ٥١ واتە ﴿ خەڵكی بە نەفخەی یەكەم هەموو ئەمرێن و پاشان بۆ جاری دووەم فوو بە شەیپور– كەڕەنادا– دەكرێت ئەوسا كوتوپڕ بەپەلە لە گۆڕەكانیان هەموو دێنە دەرێ و دەبرێن بۆلای دادگای پەروەردگاریان بۆ پاداشت و تۆڵە ﴾.

وە عبدالله ی کوڕی عەمر ڕەزای خوایان لێبێت دەفـەرمووێت : پێغەمبـەری خـواش صلى الله عليه وعلى آله وسلم فەرمووی :﴿ ثُمَّ يُنْفَخُ فِـي الـصُّورِ فَـلاَ يَـسْمَعُهُ أَحَـدٌ إِلاَّ أَصْغَى لِيتًا وَرَفَعَ لِيتًا – قَالَ – وَأَوَّلُ مَنْ يَسْمَعُهُ رَجُلٌ يَلُوطُ حَوْضَ إِبِلِهِ – قَالَ – فَيَـصْعَقُ وَيَصْعَقُ النَّاسُ ثُمَّ يُرْسِلُ اللَّهُ – أَوْ قَالَ يُنْزِلُ اللَّهُ – مَطَرًا كَأَنَّـهُ الطَّـلُّ أَوِ الظِّـلُّ – نُعْمَـانُ الشَّاكُّ – فَتَنْبُتُ مِنْهُ أَجْسَادُ النَّاسِ ثُمَّ يُـنْفَخُ فِيـهِ أُخْـرَى فَـإِذَا هُـمْ قِيَـامٌ يَنْظُـرُونَ ﴾رواه مسلم.

واتە ﴿ پاشان فوو دەکرێت بەکەڕنادا جاهیچ کەسێك نیـە نەیبیـستێت و گـوێی بـۆ ڕانەگرێت ملی بـۆ لارنەکاتـەوە فـەرمووی وەیەکـەم کەسـێك کەدەیبیـستێت پیاوێکـە حەوزی حوشترەکانی چاك دەکاتەوە پاشان فەرمووی ئەو دەمرێت و خـەڵکیش دەمـرن پاشان خوای گەورە دەینێرێت یان دایدەبـەزێنێت بارانێـك هـەروەکو نمـەی بـاران یـان تارمایی و سێبەر – نوعمان کە ڕاویەکەیە گومانی هەیە کامیانی فەرمووە – جا لـەدوای ئەوە لاشەکانی خەڵکی دەڕوێن پاشـان جـارێکی تـر فـووی پێـدا دەکرێتـەوە لـەلایـەن ئیسرافیلەوە جاڵـەو کاتەدا هەمووان هەستاونەتە سـەرپێی و بەسەرسـامیەوە دەڕوانـن و چاوەڕوانن ﴾.

وەهەموو ئوممەت یەکدەنگن لـەسەر سـەلماندن و جێگیرکردنـی فـووکردن بەکـەڕناو شەیپوردا .

ويُحْشَرُ النّاسُ يومَ القيّامةِ حُفَاةً عُراةً غُرْلاً بُهْمًا فيقِفونَ في موْقفِ القيّامـةِ، حتّى يَشْفَعَ فيهم نبيُّنَا محمـدٌ – صـلى الله عليـه وسـلم – ويُحاسِـبُهُم الله تبـارك وتعـالى، وتُنْصَبُ الموازينُ، وتُنْشَرُ الدَّواوينُ، وتَتَطايَرُ صُحُف الأَعْمالِ إلى الأَيْمانِ والشَّمائِلِ :

﴿ فَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ﴿٧﴾ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ﴿٨﴾ وَيَنقَلِبُ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا ﴿٩﴾ وَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهْرِهِۦ ﴿١٠﴾ فَسَوْفَ يَدْعُوا۟ ثُبُورًا ﴿١١﴾ وَيَصْلَىٰ سَعِيرًا ﴿١٢﴾ ﴾ الانشقاق: ٧ - ١٢

وە خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا بە بێ پەتی و ڕووتی و خەتەنەنەکراوی و هیـچیان پـێ نیە دەست بەتاڵ حەشر دەکرێن جا لـەو شـوێنەی خـوای گـەورە تـەرخانیکردووە بـۆ قیامەت دەوەستن، تا پێغەمبەرمان صلى الله عليه وعلى آله وسلم شەفاعەت و تکایان بـۆ دەکات وە تا خوای بەرز پیرۆز لێپرسینەوەیان لـەگەڵ دەکات وە تـەرازووەکان دادەنـرێن وە تۆمارەکان بڵاودەکرێنەوە کـە کـردەوەی بەنـدەکانی تێـدا تۆمـارکراوە، وەپـەڕاوی کردەوەکان بۆلای ڕاستەکان و چـەپەکان دەفـڕن ﴿جاهەرکەسـێك پـەڕاوەکانی هـات بۆلای ڕاستی و بەدەستی ڕاستی وەریگرت ئـەوە بەهەشـتیە وەهەرکەسـێك پـەڕاوەکانی هات بۆلای و بەدەستی چەپی وەریگرت ئـەوە دۆزەخیـە خـوا پـەنامان بـدان ئـامین – وەرگێڕ ﴾:

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ئینجا ئەو کەسەی نامەو دۆسیەی کـارو کردەوەکـانی درایە دەستی ڕاستی کە ئەوەش نیشانەی بەختیارییە ئیتر پرسـینەوەیەکی سـوك و ئاسـانی لەگەڵـدا دەکرێـت پاشـان پاداشـت وەردەگرێـت لـە خراپەکانیـشی دەبوردرێـت، و بەخۆشی و شادییەوە دەگەڕێتەوە لای ژن و منداڵ و خزم و کەس و کاری خواناسی لـە بەهەشتدا، وە بەڵام ئەو کەسەی کەلە پشتیەوە نامەی کردەوەکانی درایـە دەسـتی ئـەوا هـاوارو دادی لێ هەڵدەسـتێت داوای مردنـی خـۆی دەکـات، چـونکە دەزانێـت ڕادەکێشرێتە ناو ئاگرێکی بلێسەدارو سوتێنەرەوە﴾.

## ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

البعث – زیندوکردنەوە، والحشر – کۆکردنەوەی دروستکراوەکان.

البعث لەزمانەوانیدا : بریتیە لەناردن و بڵاوکردنەوە، وەلەشەرعدا بریتیە لە زیندوکردنەوەی مردووەکان لەڕۆژی دوایدا .

الحشر لەزمانەوانیدا : بریتیە لەکۆکردنەوە، وەلەشەرعدا بریتیە لە کۆکردنەوەی دروستکراوەکان لەڕۆژی دوایدا بەمەبەستی لێپرسینەوە و دادوەریکردن لە نێوانیاندا.

وەهەرکام لە البعث – زیندوکردنەوە، والحشر – کۆکردنەوەی دروستکراوەکان هەق چەسپا و سەلێنراوە بە بەڵگەی قورئان و سوننەت و یەکدەنگی موسڵمانان .

خوای گەورە دەفەرمووێت : ﴿ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ﴾ التغابن: ٧ واتە ﴿ پێیان بڵێ ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم بەڵێ سوێند بە پەروەردگارم بێگومان لە گۆڕەکانتاندا دەردەهێنرێن و زیندەکرێنەوە ﴾.

وەهەروەها خوای گەورە دەفەرمووێت : ﴿ قُلْ إِنَّ ٱلْأَوَّلِينَ وَٱلْآخِرِينَ ﴿٤٩﴾ لَمَجْمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٥٠﴾ ﴾ الواقعة: ٤٩ - ٥٠ واتە ﴿ بڵێ ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم بێگومان پێشینان و پاشینان و هەموو کۆ دەکرێنەوە بۆ کاتێکی دیاریکراو ئەویش کاتی ڕۆژی قیامەتە ﴾.

وە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرمووێت : ﴿يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى أَرْضٍ بَيْضَاءَ عَفْرَاءَ كَقُرْصَةِ النَّقِيِّ لَيْسَ فِيهَا عَلَمٌ لأَحَد ﴾[1] متفق عليه.

---

[1] البخاري : كتاب الرقاق : باب يقبض الله الأرض يوم القيامة (٦٥٢١).

ومسلم : كتاب صفة القيامة والجنة والنار : باب في البعث والنشور ... (٢٧٩٠) (٢٨) من حديث سها بن سعد رضي الله عنه.

واته ﴿ خەڵكی لەڕۆژی قیامەتدا لەسەر زەویەكی سپی سورباودا كەوەكو نانێك وایه هیچ بەرزی و نزمیەكی تێدا نەبێت حەشر دەكرێن لەو زەویەدا نیشانەی هیچ كەسێكی لەسەر نیه ﴾.

وەموسڵمانان یەكدەنگن لەسەر جێگیركرن و سەلماندنی حەشر لەڕۆژی قیامەتدا.

وە خەڵكی حەشر دەكرێن بە پێ پەتی هیچ نەعلێك و پێڵاوێكیان لە پێدانیە، وەبەڕووتی هیچ پۆشاكێكیان لەبەردا نیه، بە خەتەنە نەكراوی هیچ كەسێكیان خەتەنە نەكراوە و خەتەنەكراویان تێدا نیه، لەبەر فەرمایشتی خوای گەورە كە دەفەرموێت : ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ﴾ الأنبياء: ١٠٤ واته ﴿ هەروەك چۆن لەسەرەتاوە دروستمانكردن دیسان هەر ئاواش وەكو خۆی لێدەكەینەوە ﴾ .

وەلەبەر فەرمایشتەكەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرموێت: ﴿إِنَّكُمْ مَحْشُورُونَ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلًا ثُمَّ قَرأَ ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ وَعْدًا عَلَيْنَآ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿١٠٤﴾﴾ الأنبياء: ١٠٤ وَأَوَّلُ مَنْ يُكْسَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِبْرَاهِيمُ ﴾ متفق عليه.

واته ﴿ ئێوە لە ڕۆژی قیامەتدا حەشر دەكرێن بە پێی پەتی و ڕووتی و خەتەنە نەكراوی پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ وَعْدًا عَلَيْنَآ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿١٠٤﴾﴾ واته ﴿ هەروەك چۆن لەسەرەتاوە دروستمانكردن دیسان هەر ئاواش وەكو خۆی لێدەكەینەوە ، بەڵێنەكە ئەنجامدانی لەسەر ئێمەیە و بێگومانیش ئێمە هەرئەنجامی ئەدەین ﴾ وەیەكەم كەسێكیش پۆشاك دەكرێتەوە بەبەریدا پێغەمبەری خوا ئیبراهیمە سەلامی خوای لێ بێت ﴾.

وەلە فەرموودەکەی عبدالله ی کوڕی ئونەیس بەمەرفوعی دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وعلی آله وسلم کە پێشەوا ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە و دەفەرموویت : ﴿ يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَوْ قَالَ الْعِبَادُ عُرَاةً غُرْلًا بُهْمًا قَالَ قُلْنَا وَمَا بُهْمًا قَالَ لَيْسَ مَعَهُمْ شَيْءٌ ﴾ الحديث [1]

[1] ئەم فەرموودویە حەسەنەو پێشتر تەخریجکراوە.

## ﴿الحساب – لێپرسنەوە﴾

الحساب لەزمانەوانیدا واتە : ژمارە، وەلەشەرعدا بریتیە لە ئاگادارکردنەوەی بەندەکان لەلایەن خوای گەورەوە بەوەی کردویانە ﴿ بەواتا شارەزاکردنی بەندەکان بەو کارانەی لەژیانی دونیادا کەئەنجامیانداوە – وەرگێڕ ﴾.

کەئەوەش جێگیرو سەلمێنراوە بەبەڵگەی قورئان و سوننەت و یەکدەنگی موسڵمانان.

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم ﴿٢٦﴾ ﴾ الغاشية: ٢٥ – ٢٦ واتە ﴿ بەڕاستی گەڕانەوەیان بۆلای ئێمەیە، لەوە و دوایش بەڕاستی حیساب لێپرسینەوەیان هەر لەسەر خۆمانە کەس فریایان ناکەوێ و ناتوانێ لەسزای سەخت ڕزگاریان بکات ﴾.

وە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم لەهەنێ لەنوێژەکانیدا دەیفەرموو: ﴿اللَّهُمَّ حَاسِبْنِي حِسَابًا يَسِيرًا فَقالت عائشة رضي الله عَنها مَا الْحِسَابُ الْيَسِيرُ؟ قَالَ أَنْ يَنْظُرَ فِي كِتَابِهِ فَيَتَجَاوَزَ عَنْه﴾ رواه أحمد . وقال الألباني إسناده جيد [1].

واتە ﴿ ئەی پەروەردگارم داوات لێدەکەم لێپرسینەوەیەکی ئاسانم لەگەڵدا بکەیت دایکمان عائیشە ڕەزای خوای لێ بێت فەرمووی : لێپرسینەوەی ئاسان چۆنە؟ پێغەمبەری

---

[1] حديث صحيح : أخرجه أحمد (٤٨/٦) وابن أبي عاصم في كتاب السنة (٨٨٥) واللفظ لأحمد. وقال الألباني في تخريج السنة (٤٢٩/٢) (( إسناده صحيح )) أ.ه .
وأصل الحديث في الصحيحين عند البخاري (١٠٣)، (٦٥٣٦)، (٦٥٣٧) ومسلم (٢٨٧٦) (٧٩) عنها بلفظ : (( ليس أحد يحاسب يوم القيامة إلا هلك . قلت : أَوَ لَيْسَ يَقُولُ الله ﴿فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ﴿٨﴾ ﴾ الانشقاق: ٨ فقال إنما ذلك العرض ولكن من نوقش الحساب يهلك ﴾.

خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم فەرمووی: بەو جۆرە دەبێت کە تەماشای کیتاب و نامەکەی دەکات جا دوای ئەوە لێی دەبورێت ﴾.

وە هەموو موسڵمانان یەکدەنگن لەسەر بوونی لێپرسینەوە لەڕۆژی قیامەتدا.

وەچۆنیەتی لێپرسینەوەش بۆکەسی باوەڕدار بەجۆرێك دەبێت کە : خوای گەورە دەیباتە شوێنێك کەکەس ئاگای لێ نەبێت و دانی پێدا دەنێت بەتاوانەکانیدا تا وادەزانێت تیاچووە خوای گەورە پێی دەڵێت : لە دونیادا دام پۆشیت و نەمهێشت کەس پێت بزانێت وە ئەمڕۆش لێت خۆش دەبم جا نامەی چاکەکانی پێدەدات .

وەهەرچی دەربارەی بێباوەڕەکان و دووڕووەکانە خوای گەورە لەبەرچاوی هەموو دروستکراوەکانیدا بانگیان دەکات و دەفەرمووێت ئەوانە ئەو کەسانەن درۆیان بەناوی خواوە کرد دەبا نەفرینی خواو دوورکەوتنەوە لە ڕەحمەتی خوا لەسەر کەسانێك بێت سەتمکارن ﴾ [١]

وە لێپرسنەوە بۆ هەموو کەسێکە بێجگە لەو کەسانەی کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم جیایکردونەتەوە کە ئەوانیش ﴿ حەفتا هەزار کەسن لەم ئەمەتەدا لەوانە عوکاشەی کوڕی میحصەن دەچنە ناو بەهەشتەوە بەبێ لێپرسنەوە و بەبێ سزا﴾

---

[١] البخاري : كتاب المظالم : باب قول الله تعالى ﴿أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ١٨﴾ هود: ١٨(٢٤٤١). ومسلم : كتاب التوبة : باب قبول التوبة القاتل وإن كثر قتله (٢٧٦٨)(٥٢)من حديث عبدالله بن عمر رضي الله عنهما.

فەرمودەکە لای پێشەوا بوخاری ئاوا هاتووە:

بَاب قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى {أَلَا لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ}

٢٤٤١ – حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ حَدَّثَنَا هَمَّامٌ قَالَ أَخْبَرَنِي قَتَادَةُ عَنْ صَفْوَانَ بْنِ مُحْرِزٍ الْمَازِنِيِّ قَالَ بَيْنَمَا أَنَا أَمْشِي مَعَ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا آخِذٌ بِيَدِهِ إِذْ عَرَضَ رَجُلٌ فَقَالَ كَيْفَ سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ فِي النَّجْوَى فَقَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ إِنَّ اللَّهَ يُدْنِي الْمُؤْمِنَ فَيَضَعُ عَلَيْهِ كَنَفَهُ وَيَسْتُرُهُ فَيَقُولُ أَتَعْرِفُ ذَنْبَ كَذَا أَتَعْرِفُ ذَنْبَ كَذَا فَيَقُولُ نَعَمْ أَيْ رَبِّ حَتَّى إِذَا قَرَّرَهُ بِذُنُوبِهِ وَرَأَى فِي نَفْسِهِ أَنَّهُ هَلَكَ قَالَ سَتَرْتُهَا عَلَيْكَ فِي الدُّنْيَا وَأَنَا أَغْفِرُهَا لَكَ الْيَوْمَ فَيُعْطَى كِتَابَ حَسَنَاتِهِ وَأَمَّا الْكَافِرُ وَالْمُنَافِقُونَ فَيَقُولُ الْأَشْهَادُ ﴿هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمۡۚ أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ١٨﴾ هود: ١٨ .

بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە [١]، وەپێشەوا ئەحمدیش بە مەرفوعی لە ثوبانەوە دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وعلی آلە وسلم فەرموویەتی: ﴿کەلەگەڵ هەریەکێك لەو حەفتا هەزارەی کە دەچنە بەهەشتەوە بێ لێپرسینەوە و سزا

---

[١] البخاري : كتاب الرقاق : باب يدخل الجنة سبعون ألفاً بغير حساب (٦٥٤١).
زانای ڕاڤەکار خوا لێی خۆش بێت فەرموودەکەی نەهێناوە بەڵکو واتاکەی هێناوە، بەڵام لەبەرئەوەی ئێمە بە ئەهلی بەڵگە ناسراوین ئەوا من لەجیاتی ئەو لە بوخاریدا چۆن هاتووە ئاوا بۆتدێنم خوا لە هەموولایەك خۆش بێت:
٦٥٤١ - حَدَّثَنَا عِمْرَانُ بْنُ مَيْسَرَةَ حَدَّثَنَا ابْنُ فُضَيْلٍ حَدَّثَنَا حُصَيْنٌ ح قَالَ أَبُو عَبْد اللَّهِ و حَدَّثَنِي أَسِيدُ بْنُ زَيْدٍ حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ عَنْ حُصَيْنٍ قَالَ كُنْتُ عِنْدَ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ فَقَالَ حَدَّثَنِي ابْنُ عَبَّاسٍ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عُرِضَتْ عَلَيَّ الْأُمَمُ فَأَخَذَ النَّبِيُّ يَمُرُّ مَعَهُ الْأُمَّةُ وَالنَّبِيُّ يَمُرُّ مَعَهُ النَّفَرُ وَالنَّبِيُّ يَمُرُّ مَعَهُ الْعَشَرَةُ وَالنَّبِيُّ يَمُرُّ مَعَهُ الْخَمْسَةُ وَالنَّبِيُّ يَمُرُّ وَحْدَهُ فَنَظَرْتُ فَإِذَا سَوَادٌ كَثِيرٌ قُلْتُ يَا جِبْرِيلُ هَؤُلَاءِ أُمَّتِي قَالَ لَا وَلَكِنْ انْظُرْ إِلَى الْأُفُقِ فَنَظَرْتُ فَإِذَا سَوَادٌ كَثِيرٌ قَالَ هَؤُلَاءِ أُمَّتُكَ وَهَؤُلَاءِ سَبْعُونَ أَلْفًا قُدَّامَهُمْ لَا حِسَابَ عَلَيْهِمْ وَلَا عَذَابَ قُلْتُ وَلِمَ قَالَ كَانُوا لَا يَكْتَوُونَ وَلَا يَسْتَرْقُونَ وَلَا يَتَطَيَّرُونَ وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ فَقَامَ إِلَيْهِ عُكَّاشَةُ بْنُ مِحْصَنٍ فَقَالَ ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ قَالَ اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ مِنْهُمْ ثُمَّ قَامَ إِلَيْهِ رَجُلٌ آخَرُ قَالَ ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ قَالَ سَبَقَكَ بِهَا عُكَّاشَةُ. ﴿ وەرگێڕ ﴾.
ومسلم : كتاب الإيمان : باب الدليل على دخول طوائف من المسلمين الجنة بغير حساب ولا عذاب (٢٢٠)(٣٧٤). بحديث ابن عباس رضي الله عنهما.
لای پێشەوا موسلیمیش بەم شێوەیە :
٥٤٦ - حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ خَلَفٍ الْبَاهِلِيُّ حَدَّثَنَا الْمُعْتَمِرُ عَنْ هِشَامِ بْنِ حَسَّانَ عَنْ مُحَمَّدٍ - يَعْنِى ابْنَ سِيرِينَ - قَالَ حَدَّثَنِى عِمْرَانُ قَالَ قَالَ نَبِىُّ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِى سَبْعُونَ أَلْفًا بِغَيْرِ حِسَابٍ ». قَالُوا وَمَنْ هُمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ « هُمُ الَّذِينَ لاَ يَكْتَوُونَ وَلاَ يَسْتَرْقُونَ وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ». فَقَامَ عُكَّاشَةُ فَقَالَ ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِى مِنْهُمْ. قَالَ « أَنْتَ مِنْهُمْ ». قَالَ فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ يَا نَبِىَّ اللَّهِ ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِى مِنْهُمْ. قَالَ « سَبَقَكَ بِهَا عُكَّاشَةُ ». ﴿ وەرگێڕ ﴾.
وفي الباب : عن أبي هريرة رضي الله عنه : عند البخاري (٥٨١١) (٦٥٤٢) ومسلم (٢١٦) (٣٦٧) وعن عمران بن حصين رضي الله عنه : عند مسلم (٢١٨)(٣٧١).

حەفتا هەزار کەس هەیە ﴾ إبن كثير دەفەرمووێت : فەرموودەیەکی صەحیحە چەندین بەڵگەی بۆ باسکردووە [1].

وە یەکەم کەسیش لێپرسنەوەی لەگەڵدا دەکرێت ئەم ئوممەتەن لەبەر فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم کەدەفەرمووێت :﴿ نَحْنُ الآخِرُونَ السَّابِقُون يَوْمَ الْقِيَامَةِ الْمَقْضِيُّ بَيْنَهُمْ قبل الْخَلاَئِقِ ﴾[2] متفق عليه.

١ حسن : حديث ثوبان عند الطبراني في الكبير (١٤١٣) وأحمد (٥/ ٢٨٠, ٢٨١) من طريق محمد بن إسماعيل الحمصي حدثني أبي عن ضمضم بن زرعة عن شريح بن عبيد عن أبي أسماء الرحبي عن ثوبان قال سمعت رسول الله صلى الله عليه وعلى آله وسلم يقول : ﴿ إن ربي عز وجل وعدني من أمتي سبعين ألفاً لا يحاسبون مع كل ألف سبعين ألفاً ﴾ وسكت عنه الهيثمي في المجمع (١٠/ ٤٠٧) ولم يتكلم عليه بشيء . مع أن فيه محمد بن إسماعيل بن عياش الحمصي .

قال أبوداود لم يكون بذاك وقال أبو حاتم لم يسمع من أبيه شيئاً راجع التهذيب (٩/ ٥١, ٥٢) والمغني في الضعفاء للذهبي (٢/ ٥٥٥) . وللحديث شواهد كثيرة ذكرها ابن كثير في النهاية (٣٢٢: ٣٣٠) منها حديث أنس عند البزار فيه أبو عاصم العباداني لين الحديث كما في التقريب . ومنها : حديث أبي أمامة : عند أحمد (٥/ ٢٦٨) والترمذي (٣٤٣٧) وابن ماجة (٤٢٨٦) وصححه إبن حبان ( ٢٦٤٢–موارد).

ومنها حديث أبي سعيد الخدريَ عند ابن أبي عاصم في السنة (٨١٤) وضعف إسناده الألباني في تخريج السنة (٣٨٥/٢) .

وغير ذلك من شواهد وراجع النهاية لابن كثير.

وبالجملة فالحديث حسن على أقل أحواله بهذه الشواهد.

٢ الحديث بهذا اللفظ : عند مسلم كتاب الجمعة : باب هداية هذه الأمة ليوم الجمعة (٨٥٦)(٢٢) من حديث أبي هريرة وحذيفة رضي الله عنهما ولفظه عند البخاري (٨٧٦) ومسلم (٨٥٥) (٢١) : (( نَحْنُ الآخِرُونَ السَّابِقُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بَيْدَ أَنَّهُمْ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِنَا )) من حديث أبي هريرة.

خوێنەری بەرێز ئەوەی توێژەر دەفەرمووێت ئەوە دەربڕینی موسلیمە زۆری بۆگەڕام بەڵام دەقاودەق بەو شێوەیە نەمبینی بەڵکو هەمان ئەو ژمارەیەی ئەو دەفەرمووێت جیاوازیەکی تێدایە من هەمووی دێنم تابزانی جیاوازیەکە چیەو سوودی لێ بینی:

( ٨٥٦ ) (٢٢) : وَحَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ وَوَاصِلُ بْنُ عَبْدِ الأَعْلَى قَالاَ حَدَّثَنَا ابْنُ فُضَيْلٍ عَنْ أَبِى مَالِكٍ الأَشْجَعِىِّ عَنْ أَبِى حَازِمٍ عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ وَعَنْ رِبْعِىِّ بْنِ حِرَاشٍ عَنْ حُذَيْفَةَ قَالاَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– « أَضَلَّ اللَّهُ عَنِ الْجُمُعَةِ مَنْ كَانَ قَبْلَنَا فَكَانَ لِلْيَهُودِ يَوْمُ السَّبْتِ وَكَانَ لِلنَّصَارَى يَوْمُ الأَحَدِ فَجَاءَ اللَّهُ بِنَا فَهَدَانَا اللَّهُ لِيَوْمِ الْجُمُعَةِ فَجَعَلَ الْجُمُعَةَ وَالسَّبْتَ وَالأَحَدَ وَكَذَلِكَ هُمْ تَبَعٌ لَنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ <u>نَحْنُ الآخِرُونَ مِنْ أَهْلِ الدُّنْيَا وَالأَوَّلُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ الْمَقْضِىُّ لَهُمْ قَبْلَ الْخَلاَئِقِ ». وَفِى رِوَايَةِ وَاصِلٍ الْمَقْضِىُّ بَيْنَهُمْ.</u>

واتە ﴿ ئێمە دواین نەتەوەین کە هاتووین بەڵام لەپێش هەموو دروستکراوەکاندا لەڕۆژی قیامەتدا دادوەری دەکرێین لە نێوانیاندا ﴾.

وە ئیبن و ماجە لە ئیبن و عەباسەوە بەمەرفوعی ڕیوایەتی کردووە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرموویت :﴿ نحن آخر الأمم، وأول من يحاسب﴾ الحديث.[1] واتە ﴿ ئێمە کۆتا نەتەوەین، وە یەکەم نەتەوەیشین لێپێچینەوەی لەگەڵدا دەکرێت ﴾.

وەیەکەم شتێکیش بەندە لەسەری لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت لەمافەکانی خوای گەورە نوێژە لەبەر فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم کەدەفەرموویت :﴿ أَوَّلُ مَا يُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ الصَّلاَةُ فإنْ صَلُحَتْ صَلُحَ سَائِرُ عَمَلِهِ ، وإنْ فَسَدَتْ فَسَدَ سَائِرُ عَمَلِهِ ﴾رواه الطبراني في الأوسط وسنده لا بأس به إن شاء الله, قاله المنذري في الترغيب والترهيب[2]ص(٢٤٦) ج١ .

---

١ أخرجه ابن ماجة (٤٢٩٠) وأحمد (١/ ٢٨٢, ٢/ ٢٧٤, ٣٤٢) والبيهقي في دلائل النبوة (٥/ ٤٨٢) من حديث ابن عباس رضي الله عنهما، وقال البويصري في الزوائد (٣/ ٣١٧) : (( هذا إسناد صحيح رجاله ثقات ))، وصححه الشيخ الألباني .

فەرموودەکە موژدەی تێدایە بۆ ئێمەی موسڵمان جوان تەماشای بکەو سوپاسی خوابکە:

٢٣٧٤ – " نحن آخر الأمم ، و أول من يحاسب ، يقال : أين الأمة الأمية و نبيها ؟ فنحن الآخرون الأولون " .

قال الألباني في " السلسلة الصحيحة " ٥ / ٤٨٨ : أخرجه ابن ماجة ( ٢ / ٥٧٥ ) عن حماد بن سلمة عن سعيد بن إياس الجريري عن أبي نضرة عن ابن عباس مرفوعا . قلت : و هذا إسناد صحيح، ورجاله ثقات كما قال

البوصيري في " زوائد ابن ماجة " ( ٢٦٢ / ١ ) . ﴿ وەرگێڕ ﴾.

٢ حديث صحيح : أخرجه الترمذي (٤١٣) والنسائي (١/ ٢٣٢) وابن ماجة (١٤٢٦) من حديث أبي هريرة رضي الله عنه وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب (١/ ١٨٥).

واتە ﴿ یەکەم شتێك بەندە لەسەری لێپێچینەوەی لەگەڵدا دەکرێت نوێژە جائەگەر بەباشی ئەنجامی دابوو ئەوا هەموو کارەکانی تری چاك بووە وەئەگەر خراپیش بوو ئەوا هەموو کارەکانی تری خراپ بووە ﴾.

وەیەکەم شتێکیش لەنێوان خەڵکدا دادوەری دەکرێت لەمافی خەڵکیدا لە خوێندایە لەبەر فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم کەدەفەرمووێت: ﴿أَوَّلُ مَا يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِي الدِّمَاءِ﴾ متفق علیه [1].

واتە ﴿ یەکەم شتێك دادوەری تێدا دەکرێت لەنێوان خەڵکیدا لەڕۆژی قیامەتدا لە خوێندایە ﴾.

..............................................................

[1] البخاري : كتاب الديات : باب قوله تعالى ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ ﴾ النساء: ٩٣.

ومسلم : كتاب القسامة : باب المجازاة بالدماء في الآخرة . (١٦٧٨) (٢٨) من حديث ابن مسعود رضي الله عنه.

والميزانُ له كِفتانِ ولِسانٌ، تُوزَنُ به الأعمال :﴿ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٢﴾ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمْ فِى جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ﴿١٠٣﴾ ﴾ المؤمنون: ١٠٢ ـ ١٠٣

وە تەرازوو دووتاو زوبانی هەیە، کردەوەکانی پێ کێشانەو پێوانە دەکرێت : واتە ﴿جائەوەی تەرازووی چاکەکانی قورس بێت ئائەوانە سەرفرازوو سەرکەوتوون، بەڵام ئەوەی تای تەرازووی چاکەکانی سوك بێت ئەوانە ئەو کەسانەن خۆیان لە دەست داوەو خۆیان ڕیسواکرووە و بەهەمیشەی لەناو دۆزەخدا دەمێننەوە ﴾.

ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

الموازين

تەرازوەکان کۆیە تاکەکەی تەرازووە، کەئەوەش لەزمانەوانیدا بریتیە لەوەی کە شتەکانی پێ پێوانە دەکرێت ئیتر ئەو شتانە سوك بن یان قورس، وەلەشەرعیشدا : بریتیە لەوەی کە خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا دایدەنێت بۆ کێشانەکردنی کردەوەکانی بەندەکان وە بێگومان هەریەکە لە قورئان و سوننەت و کۆدەنگی پێشین بەڵگەیە لەسەری .

خوای گەورە دەفەرمووێت : ﴿ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٢﴾ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمْ فِى جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ﴿١٠٣﴾ ﴾ المؤمنون: ١٠٢ ـ ١٠٣

واتە ﴿جائەوەی تەرازووی چاکەکانی قورس بێت ئائەوانە سەرفرازوو سەرکەوتوون، بەڵام ئەوەی تای تەرازووی چاکەکانی سوك بێت ئەوانە ئەو کەسانەن خۆیان لە دەست داوە و خۆیان ڕیسواکرووە و بەهەمیشەی لەناو دۆزەخدا دەمێننەوە ﴾.

وەهەروەها دەفەرمووێت : ﴿ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَـٰسِبِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾ الأنبياء: ٤٧

واتە ﴿ ئێمە پێوەرو تەرازووەکانی دادپەروەری لە ڕۆژی قیامەتدا دادەنێین، جاهیچ کەس بە هیچ شێوەیەك ستەمی لێناکرێت ئەگەر چی بەئەندازەی یەك دانە گەردیلەش بێت ئیتر کاری چاکە یان خراپە ئێمە ئامادەی دەکەین دەیهێنینە مەیدان، جائەوەندە بەسە بۆ ئێمە کەوا بەووردی حیساب و لێپرسینەوە ئەنجام دەدەین ﴾.

وە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرمووێت :﴿ كَلِمَتَانِ حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ ﴾[1] متفق عليه.

واتە ﴿ دوو وشە هەن خۆشەویستن لای خوای میهرەبان ئاسان وسوکن لەسەر زوبان قورسن لەتەرازوودا سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ ﴾.

وە پێشین کۆکن لەسەر بوونی ئەوە .

کەئەوەش بریتیە لە تەرازوویەکی ڕاستەقینە دوو تای هەیە لەبەرفەرموودەکەی عبداللەی کوڕی عەمری کوڕی عاص لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وعلى آلە وسلم کە دەربارەی خاوەن بلیتەکە دەفەرمووێت :﴿ فَتُوضَعُ السِّجِلَّاتُ فِي كَفَّةٍ وَ

---

[1] البخاري : كتاب التوحيد : باب قول الله تعالى ﴿وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾ (٧٥٦٣).
ومسلم : كتاب الذكر والدعاء : باب فضل التهليل ... (٢٦٩٤) (٣١). من حديث أبي هريرة رضي الله عنه وهو خاتمة صحيح البخاري.

الْبِطَاقَة فِي كَفَّةٍ﴾ الحديث رواه الترمذي وابن ماجة قال الألباني إسناده صحيح[١] واتـه: ﴿ جـا پەرتووكـەكانى بـۆ دەخرێتـە تايـەكى تەرازووەكـە وە بليتەكـەش لـەو تاكـەى تريدا...﴾[٢]

---

١ حديث صحيح : أخرجه أحمد (٢/ ٢١٣) والترمذي (٢٦٣٩) وابن ماجة (٤٣٠٠) وإسناده صحيح. وقد صححه ابن حبان (٢٥٢٤) والحاكم (١/ ٦, ٥٢٩) ووافقه الذهبي، وحسنه الترمذي، وصححه الألباني في الصحيحة (١٣٥)، وقال (( والأحاديث في ذلك متضافرة إن لم تكن متواترة))أ.هـ .

٢ ئەوەى سەرەوە بەشێكە لەفەرموودەيەكى درێژ كە تيايدا باسى پياوێك دەكات خاوەنى بليتى ﴿أشهد أن لا إلـه إلا الله وأشهد أن محمدا رسول الله ﴾ و بەهۆى ئەو يليتەوە دەچێتە بەهەشتەوە جابۆ زياتر شـارەزابوون بفـەرموو تـەواوى فەرموودەكە ببينە : لەموسنەدى پێشەوا ئەحمەددا:

٦٩٩٤ – حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ إِسْحَاقَ الطَّالْقَانِيُّ حَدَّثَنَا ابْنُ مُبَارَكٍ عَنْ لَيْثِ بْنِ سَعْدٍ حَدَّثَنِي عَامِرُ بْنُ يَحْيَى عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْحُبُلِيِّ قَالَ سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ يَقُولُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَسْتَخْلِصُ رَجُلًا مِنْ أُمَّتِي عَلَى رُءُوسِ الْخَلَائِقِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيَنْشُرُ عَلَيْهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ سِجِلًّا كُلُّ سِجِلٍ مَدَّ الْبَصَرِ ثُمَّ يَقُولُ لَهُ أَتُنْكِرُ مِنْ هَذَا شَيْئًا أَظَلَمَتْكَ كَتَبَتِي الْحَافِظُونَ قَالَ لَا يَا رَبِّ فَيَقُولُ أَلَكَ عُذْرٌ أَوْ حَسَنَةٌ فَيُبْهَتُ الرَّجُلُ فَيَقُولُ لَا يَا رَبِّ فَيَقُولُ بَلَى إِنَّ لَكَ عِنْدَنَا حَسَنَةً وَاحِدَةً لَا ظُلْمَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ فَتُخْرَجُ لَهُ بِطَاقَةٌ فِيهَا أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ فَيَقُولُ أَحْضِرُوهُ فَيَقُولُ يَا رَبِّ مَا هَذِهِ الْبِطَاقَةُ مَعَ هَذِهِ السِّجِلَّاتِ فَيُقَالُ إِنَّكَ لَا تُظْلَمُ قَالَ فَتُوضَعُ السِّجِلَّاتُ فِي كَفَّةٍ قَالَ فَطَاشَتْ السِّجِلَّاتُ وَثَقُلَتْ الْبِطَاقَةُ وَلَا يَثْقُلُ شَيْءٌ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ.

واتە ﴿ خواى گەورە لەڕۆژى دوايدا پياوێك لە ئوممەتەكەم دێنێت لەبەرچاوى هەموو خـەڵكى ڕايدەوەستێنێت، جـا نەوەدو نۆ پەرتوكى بۆ بڵاو دەكرێتەوە، هەرپەرتوكەش چەند چاو بڕبكات درێژە، پاشان دەفەرمووێت : ئايـە نكـۆڵى لەهيچ كام لەم تاوانانە دەكەيت ؟، ئايە فريشتە نووسەرەكانم ستەميان لێكرديت ؟ دەڵێت نەخێر، ئەى پـەروەردگارم، خواى گەورە دەفەرمووێت ئايە هيچ پاساو و بيانوويەكت هەيە، يان هيچ چاكەيەكت هەيە ؟ جاماوەيـەك بـىٚ دەنـگ دەبێت، پاشان دەڵێت : نەخێر ئەى پەروەردگار، جا خواى گەورە دەفەرمووێت بـەڵێ، تـۆ يـەك چـاكەت لاى ئێمـە هەيە، ئەمڕۆ هيچ ستەمێكت لێناكرێت، جابليتێكى بۆ دەردەكرێت تێيدا نووسـراوە ﴿أَشْـهَدُ أَنْ لَـا إِلَـهَ إِلَّـا اللَّـهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ ﴾ جا دەفـەرمووێت :بيهێـنن بيكێـشن، جائـەو دەڵێـت : ئـەى پـەروەردگارم ئـەم بليتـە چـيە لەبەرامبەر ئەو هەموو تۆمارانە، ئەويش دەفەرمووێت : تۆ ئەمڕۆ هيچ ستەمێكت لێناكرێت، پێغەمبەرى خوا صـلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرمووێت : ئەوجا تۆمارەكانى بۆ دەخرێتە تايەكى تەرازووەكە بليتەكەش دەخرێتە تاكەى ترى تەرازووەكە، فەرمووى : جا تاى تۆمارەكان بەرزبوويەوە و بليـتەكە لەو هەموى قورستر بوو، فەرمووى بێگومـان هـيچ شتێك نييە لـەبەرامبەر ناوى خواى گەورەدا قورس بێت ﴾.

مژدەت لى بێت ئەى ئەو كەسەى شەيرك بۆ خوا دانانێت و هاوارناكەيتە جگە لەخواو لـە غـيرى خـوا ناپاڕێتـەوە و سـوژدە بۆ هيچ گۆڕێك نابەيت و ئاژەڵ بۆ جگە لەخوا سەرنابڕيت و نووشتەو تەلـيسم بە خۆتا هەڵنـاواسيت، ئـەوەت بەسە كەبەتەنها خوا دەپەرستيت و سەرى بۆدادەنەوێنيت، هەرگيز خەفەت مەخۆ باخەڵكى هەر ناوەتۆرەت لىٚ بنێن تۆ بەوەى سەلـەفيت واتە ئەهلى سوننەو جەماعەيت هەزاران مژدەت لەلايەن خواو پێغەمبەرى خواوە بۆ هەيە وە ئەگەر هەزار ساڵيش بژيت هەر دەبێت بمريت بۆيە سەلـەفيانە بژى و سەلـەفيانە بانگەوازو پەرستش بكەو سـەلـەفيانەش بمـرە، وەداوا لـە خواى گەورە بكە لەسەر ڕێبازى پێغەمبەرى خواو پێشيە چاكەكان بمانژيـەنێت و بمانمرێنێـت و زينـدوومان بكاتەوە . ئامين. ﴿ وەرگێڕ ﴾.

وە زانایان جیاوازن لەوەدا ئایە یەك تەرازوە یان چەندین تەرازوە؟

جا هەندێکیان دەفەرموون : چەندین تەرازوە بەگوێرەی نەتەوەکان یان تاکەکان یان کردەوەکان لەبەرئەوەی لەقورئاندا تەنها بەشێوەی کۆهاتووە، وەهەرچی دەربارەی بەتاك هاتنی لەفەرموودەدا ئەوە بۆ ڕەچاوکردنی ﴿جنس – ڕەگەزە﴾ .

وەهەندێکی تریان فەرموویانە : تەنها یەك تەرازوە لەبەرئەوەی لەفەرموودەدا بەتاکی هاتووە، وەهەرچی دەربارەی بەکۆ هاتنیشی لەقورئاندا بۆ ڕەچاوکردنی کێشراو و پێوانەکراوەکەیە .

وەهەردووکیشیان دەگونجێت وابێت خواش باشتر دەزانێت.

ئەوەشی دەکێشرێت کردەوەیە لەبەر ڕووکەشی ئایەتەکەی پێشوو وە فەرموودەکەی دوای ئەویش، وەووتراویشە پەڕاوەکانی کارە لەبەر فەرموودەکەی خاوەنی بلیتەکە، وە وتراوە بکەرەکە خۆی دەکێشرێت لەبەر فەرموودەکەی ئەبی هورەیرە ڕەزای خوای لێ بێت کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آلە وسلم دەفەرموێت :﴿ إِنَّهُ لَيَأْتِي الرَّجُلُ الْعَظِيمُ السَّمِينُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَا يَزِنُ عِنْدَ اللَّهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ وَقَالَ اقْرَءُوا ﴿فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَزْنًا ﴿١٠٥﴾﴾ الكهف: ١٠٥ ﴾ متفق عليه [1].

واتە ﴿ لەڕۆژی قیامەتدا پیاوێکی گەورەی قەڵەو دێت، لای خوای گەورە کێشی باڵە مێشولەیەکی نیە، فەرمووی جا ئەم ئایەتە بخوێننەوە ﴿ جا لەڕۆژی قیامەتدا هیچ جۆرە بایەخ و سەنگێك بۆ ئەو بێباوەڕانە دانانێین ﴾.

وەهەندێ لەزانایان هاتوون ئەم دەقانەیان کۆکردوەتەوە بەجۆرێك کە هەوو ئەوانە دەکێشرێت، یان کە کێشان لە ڕاستیدا بۆ ئەو تۆمارانەیە کە تیایاندا نوسراوەتەوە بە جۆرێك کەئەو تۆمارانە قورس و سوك دەبن بە گوێرەی کردەوە نووسراوەکان کێشانەکە وای لێدێت هەروەکو ئەوەیە بلێیت کێشانەکە بۆ کردەوەکانە چونکە تۆمارەکەش ئەو کردەوانەی تیادا تۆمارکراوە و لەخۆوە پەیدا نەبووە، وەهەرچی

---

[1] البخاري : كتاب التفسير من سورة الكهف : باب ﴿أُولَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ رَبِّهِمْ وَلِقَآئِهِۦ﴾ (٤٧٢٩).

ومسلم : كتاب صفة القيامة والجنة والنار (٢٧٨٥)(١٨).

دەربارەی کێشانی خاوەن کارەکەیە جامەبەست پێی پلەو پایەو ڕێزەکەیەتی . وەئـەوەش کۆبەندییەکی باشە وەخواش باشتر دەزانێت [١].

[١] تێبینی وەرگێڕ : خوێنەری ئازیز زۆر ئاساییە بووترێت هەرکام لەو سیانە پێوانـەو کێشانە دەکرێت چونکە هیچ دژایەتیەك نیە لەنێوانیاندا لەبەر ڕۆشنایی فەرموودەکان، جاکەوایە بەڵگەکان لەسەرئەوەن کە هەرکام لە ﴿ کەسەکان خودی خۆیان، ئەو تۆمارانەی کردەوەکانی تێدا تۆمارکراوە، کردەوەکـان ﴾ بـۆ هەریەکەیـشیان بەڵگـەی ڕاسـت و دروست هەیە و لەپێشەوە باسکرا بەم شێوەیە بۆت کۆدەکەمەوە :

١- بۆ کێشانی کردەوەکان : پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرمووێت : ﴿كَلِمَتَانِ حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ ﴾١متفق عليه.

واتە ﴿ دوو وشە هەن خۆشەویست لای خوای میهرەبان ئاسان وسوکن لەسەر زوبان قورسـن لەتـەرازوودا سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ ﴾. ئەوە بەڵگەیە لەسەر کێشانی کردەوەکان.

٢- بۆکێشانی تۆمارە لاپەڕەکان : پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرمووێت :﴿ إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَسْتَخْلِصُ رَجُلًا مِنْ أُمَّتِي عَلَى رُءُوسِ الْخَلَائِقِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيَنْشُرُ عَلَيْهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ سِجِلًّا كُلُّ سِجِلٍّ مَدَّ الْبَصَرِ ثُمَّ يَقُولُ لَهُ أَتُنْكِرُ مِنْ هَذَا شَيْئًا أَظَلَمَتْكَ كَتَبَتِي الْحَافِظُونَ قَالَ لَا يَا رَبِّ فَيَقُولُ أَلَكَ عُذْرٌ أَوْ حَسَنَةٌ فَيُبْهَتُ الرَّجُلُ فَيَقُولُ لَا يَا رَبِّ فَيَقُولُ بَلَى إِنَّ لَكَ عِنْدَنَا حَسَنَةً وَاحِدَةً لَا ظُلْمَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ فَتُخْرَجُ لَهُ بِطَاقَةٌ فِيهَا أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ فَيَقُولُ أَحْضِرُوهُ فَيَقُولُ يَا رَبِّ مَا هَذِهِ الْبِطَاقَةُ مَعَ هَذِهِ السِّجِلَّاتِ فَيُقَالُ إِنَّكَ لَا تُظْلَمُ قَالَ فَتُوضَعُ السِّجِلَّاتُ فِي كَفَّةٍ قَالَ فَطَاشَتْ السِّجِلَّاتُ وَثَقُلَتْ الْبِطَاقَةُ وَلَا يَثْقُلُ شَيْءٌ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ ﴾

واتـە ﴿ خـوای گـەورە لـەڕۆژی دوایـدا پیاوێـك لـە ئوممەتەکـەم دێنێـت لەبەرچـاوی هـەموو خـەڵکی ڕایدەوەستێنێت، جا نەوەدو نۆ پەرتوکی بـۆ بڵـاو دەکرێتـەوە، هەرپەرتوکـەش چـەند چـاو بڕبکـات درێـژە، پاشـان دەفەرمووێت : ئایە نکۆڵی لەهیچ کام لەم تاوانانە دەکەیت ؟، ئایە فریشتە نووسـەرەکانم ستەمیان لێکردیت ؟ دەڵێت نەخێر، ئەی پەروەردگارم، خوای گەورە دەفەرمووێت ئایە هیچ پاساو و بیانوویەکت هەیە، یان هیچ چاکەیەکت هەیە ؟ جاماوەیەك بێ دەنگ دەبێت، پاشان دەڵێت : نەخێر ئەی پەروەردگار، جا خوای گەورە دەفەرمووێت بەڵێ، تۆ یەك چاکەت لای ئێمە هەیە، ئەمڕۆ هیچ ستەمێکت لێناکرێت، جابلیتێکی بۆ دەردەکرێت تێـدا نووسـراوە ﴿أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ ﴾ جا دەفەرمووێت :بیهێنن بیکێشن، جائـەو دەڵێـت : ئـەی پـەروەردگارم ئـەم بلیتە چیە لەبەرامبەر ئەو هەموو تۆمارانە، ئەویش دەفەرمووێت : تۆ ئەمڕۆ هیچ ستەمێکت لێناکرێت، پێغەمبەری خـوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرمووێت : ئەوجا تۆمارەکانی بۆ دەخرێتە تایەکی تەرازووەکـە بلیتەکـەش دەخرێتـە تاکەی تری تەرازووەکە، فەرمووی : جا تای تۆمارەکان بەرزبوویەوە و بلیتەکە لەو هەمووی قورسـتر بـوو، فـەرمووی یێگومان هیچ شتێك نیە لـەبەرامبـەر ناوی خوای گەورەدا قورس بێت ﴾. ئەوە بەڵگەیە لـەسەر کێشانی تۆمـارو پـەڕە تۆمارکراوەکان.

٣- بۆکێشانی خودی کەسەکان : پێغەمبـەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرمووێت :﴿ إِنَّهُ لَيَأْتِي الرَّجُلُ الْعَظِيمُ السَّمِينُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَا يَزِنُ عِنْدَ اللَّهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ وَقَالَ اقْرَءُوا ﴿فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا (١٠٥)﴾ الكهف: ١٠٥ ﴾ متفق عليه.

واتە ﴿لەڕۆژی قیامەتدا پیاوێکی گەورەی قەڵەو دێت، لای خوای گەورە کێشی باڵە مێشولەیەکی نیە، فەرمووی جـا ئەم ئایەتە بخوێننەوە ﴿جا لەڕۆژی قیامەتدا هیچ جۆرە بایەخو سەنگێك بـۆ ئـەو بێـاوەڕانـە دانـانێین﴾. ئـەوە بەڵگـەیـە لەسەر کێشانی مرۆڤەکان.

کەواتە خۆشەویستان هیچ دژایەتیەك نیە لە نێوانیانداو دەگونجێت هەرسێکیان بکێشرێت والله أعلم ﴿ وەرگێڕ ﴾.

## ﴿نشر الدواوين - بڵاوکردنەوەی تۆماری کردنەوەکان﴾

النشر : لەزمانەوانیدا بەواتای کردنەوەی پەرتووکێك یان بڵاوکردنەوەی شتێك دێت، وەلەشەرعدا بەواتای دەرخستن و ئاشکراکردنی لاپەڕەکانی کردەوەکان لەڕۆژی قیامەتدا وە دابەشکردنیان .

وە ﴿الدواوین کۆی دیوان ﴾ە کەئەویش لەزمانەوانیدا بریتیە لەو پەرتووکەی سەرژمێری سەربازی تێدا دەکرێت و ناویانی تێدا تۆماردەکرێت وە هاوشێوەی ئەوە، وەلە شەرعدا : بریتیە لەو پەڕانەی کە کردەوەکانی تێیدا تۆمارکراوە کە فریشتەکان نوسیویانە لەسەر بکەرەکەی ﴿ واتە کەسەکە چی کردبێت ئەوان نوسیویانە چونکە ئیشیان تەنها ئەوەیە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴿١٨﴾ ﴾ق: ١٨واتە هەروتەیەکی لەدەم دەردەچێت فریشتەی چاودێری ئامادە لەلایەتی دەینووسێت ﴿ وەرگێڕ ﴾. ﴾.

جا بڵاوکردنەوەی الدواوین ئاشکراکردنی نامەی کردەوەکانە لەڕۆژی قیامەتدا جا ئەو پەڕاوە تۆمارکراوانە دەفڕن بۆلای ڕاستی بەندەکان و بۆلای چەپی بەندەکان ﴿بەجۆرێك ئەوەی باوەڕدارە دەکەوێتە پێشیەوە و بەدەستی ڕاست وەریدەگرن وەئەوانەی بێباوەڕو و دووڕوون دەکەوێتە پشتیانەوە و بەدەستی چەپ وەریدەگرن – وەرگێڕ ﴾.

وەئەوەش چەسپاوە بەبەڵگەی قورئان و سوننەت و کۆدەنگی ئوممەت.

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ﴿٧﴾ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ﴿٨﴾ وَيَنقَلِبُ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا ﴿٩﴾ وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهْرِهِۦ ﴿١٠﴾ فَسَوْفَ يَدْعُوا۟ ثُبُورًا ﴿١١﴾ وَيَصْلَىٰ سَعِيرًا ﴿١٢﴾ ﴾ الانشقاق: ٧ – ١٢

واته ﴿ ئینجا ئەو کەسەی نامەو دۆسیەی کارو کردەوەکانی درایە دەستی ڕاستی کە ئەوەش نیشانەی بەختیارییە ئیتر پرسینەوەیەکی سوك و ئاسانی لەگەڵدا دەکرێت پاشان پاداشت وەردەگرێت لە خراپەکانیشی دەبوردرێت، و بەخۆشی و شادییەوە دەگەڕێتەوە لای ژن و منداڵ و خزم و کەس و کاری خواناسی لە بەهەشتدا، وە بەڵام ئەو کەسەی کەلە پشتیەوە نامەی کردەوەکانی درایە دەستی ئەوا هاوارو دادی لێ هەڵدەستێت داوای مردنی خۆی دەکات، چونکە دەزانێت ڕادەکێشرێتە ناو ئاگرێکی بلێسەدارو سوتێنەرەوە ﴾.

وەهەروەها دەفەرموویت : ﴿ وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ فَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِي لَمْ أُوتَ كِتَٰبِيَهْ ﴿٢٥﴾ ﴾ الحاقة: ٢٥ واته ﴿ بەڵام ئەو کەسەی کارنامەی دەدرێتە دەستی چەپی جا دەڵێ خۆزگە! نامەکەم پێنەدرایە ﴾.

وە لەدایکمان عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێت کە پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم پێی ووت : ﴿هل تذكرون أهليكم ؟ قال : أمَّا في ثلاثة مَواطِنَ ، فلا يذكر أحد أحدا : عند الميزان حتى يعلم أيخِف ميزانُه ، أم يثقل ؟ وعند تطاير الصحف حتى يعلم أين يقع كتابه : في يمينه ، أم في شماله ، أم من وراء ظهره ؟ وعند الصراط إذا وُضِع بين ظهريّ جهنم حتى يجوزَ ﴾ رواه أبو داود والحاكم وقال صحيح على شرطهما[1] .

---

١ أخرجه أبوداود (٤٧٥٥) والحاكم في المستدرك (٤/ ٥٧٨) والآجري في الشريعة (٣٨٥) من طرق عن الحسن عن عائشة . وذكر الشيخ الألباني في ضعيف أبي داود .

وقال الحاكم : صحيح إسناده على شرط الشيخين لولا إرسال فيه بين الحسن وعائشة وأقره الذهبي.

وللحديث طريق آخر رواه أحمد (٦/ ١١٠) من طريق إبن لهيعة عن خالد بن أبي عمران عن القاسم بن محمد عن عائشة .

وقال الهيثمي في المجمع (١٠/ ٣٥٩) (( عند أبي داود طرف منه رواه أحمد وفيه إبن لهيعة وهو ضعيف وقد وثق، وبقية رجاله رجال صحيح)).

واتە ﴿ ئایە خێزان و ژن و منالّ و کەس و خزمتان دەناسنەوە، فەرمووی : بەلّیّ بەلام لەسیّ شوێندا نەخێر جا لەو سیّ شوێنەدا هیچ کەس کەس ناناسێتەوە : لە لای تەرازو تا دەزانێت ئایە کێشانەکەی سوکە یان قورسە، وەلەلای فڕینی لاپەڕە تۆمارکراوەکاندا تا دەزانێت دەکەوێتە چ شوێنێکەوە دەکەوێتە لای ڕاستیەوە یان لای چەپیەوە یان دەکەوێتە پشتیەوە، وەلەلای پردی صراط دا ئەگەر دانرا لەسەر پشتی دۆزەخ تا تێدەپەڕێت﴾ .

وەهەموو موسلّمانان کۆدەنگن لە جێگیربوون و سەلماندنی.

## چۆنیەتی وەرگرتنی نامەکە ﴿ پەرتووکەکە﴾:

باوەڕدار بەدەستی ڕاستی نامەکەی وەردەگرێت جا زۆر دلّخۆش دەبێت و موژدە دەدات بەکەسانی ترو دەلّێت : ﴿هَآؤُمُ اقْرَءُوا۟ كِتَـٰبِيَهْ ﴿١٩﴾﴾ الحاقة: ١٩واتە ﴿ جا لەخۆشی و شادیدا بەدەنگی بەرز دەلّێت : فەرموو ئەوەتە نامەکەم بگرن و بیخوێننەوە﴾.

وە بێباوەڕ بەدەستی چەپ یان لە پشتیوە نامەکەی وەردەگرێت جاهاوار دەکات دەلّیّ وەیل و مالّوێرانی بۆمن :﴿يَـٰلَيْتَنِى لَمْ أُوتَ كِتَـٰبِيَهْ ﴿٢٥﴾ وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيَهْ ﴿٢٦﴾﴾ الحاقة: ٢٥ ـ ٢٦

واتە:﴿ خۆزگە نامەکەم پێنەدرایە، وە نەمزانیایە سەرئەنجامی لێپرسینەوەم چییە ﴾.

****************************************

**ولنبيِّنا محمدٌ – صلى الله عليه وسلم – حوْضٌ في القِيامَةِ ماؤُهُ أشَدُّ بياضًا مِنَ اللَّبَنِ، وأحْلَى مِنَ العَسَلِ، وأَبَارِيقُهُ عَدَدَ نُجُومِ السَّمَاءِ، مَنْ شَرِبَ مِنْهُ شَرْبَةً لَمْ يَظْمَأْ بعْدَهَا أبدًا.**

**وە بۆ پێغەمبەرەکەمان محمد صلى الله عليه وعلى آله وسلم لەڕۆژی قیامەتدا حەوزێك هەیە ، ئاوەکەی سپیترە لەشیر، وەخۆشتر و شیرینترە لە هەنگوین، وەژمارەی قاپەکانی ﴿ سوراحیەکانی ﴾ کە ئاوی پێ دەخورێتەوە بەقەد ئەستێرەکانی ئاسمانە. هەرکەسێك لێی بخواتەوە ئیتر لەدوای ئەوە وە هەرگیز تینووی نابێت.**

**ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین**

## ﴿الحوض﴾

**الحوض : ئەستێل : لەزمانەوانیدا واتە کۆبوونەوە گرد بووەوە ئاوەکە گرددەبێتەوە ئەگەر کۆبووە وە، وە بۆ ئەو شوێنە بەکاردەهێنرێت کە ئاوی تێدا کۆبووبێتەوە ﴿هەرلەبەرئەوەشە لەزمانی شیرنی کوردیدا پێی دەگوترێت ئەستێل یان ئەستێرەك یان ئاوکۆ کەهەرکام لەوانە ڕاستە – وەرگێڕ ﴾.**

**وەلەشەرعدا : حەوزێکی ئاوە کەلە کەوسەرەوە دیتە خوارەوە کەلەناو بەهەشتدایە لە گۆڕەپانی قیامەتدا بۆ پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وعلى آله وسلم وەبەڵگەش لەسەری فەرموودە موتەواترەکانە وە کۆدەنگی ئەهلی سوننەیە لەسەری .**

وە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرموویت : ﴿ إِنِّي فَرَطُكُمْ عَلَى الْحَوْضِ ﴾[١] واتە ﴿ من پێشتان دەکەوم بۆسەر حەوزی کەوسەرو لەوێ چاوەڕوانتانم﴾.

پێشین ئەهلی سوننە کۆدەنگن لەسەر جێگیرکردنی و سەلماندنی، وەبێگومان موعتەزیلەکان حەوززی کەوسەر ڕەدی دەکەنەوە و باوەڕیان پێ نیە، وەئێمەش بە دوو ڕاستی وەڵامیان دەدەینەوە:

١- ئەو هەموو فەرموودە موتەواترەی لەوبارەوە هاتووە لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وعلى آله وسلم.

٢- کۆدەنگی ئەهلی سوننە لەسەر ئەوە.

## ﴿ چۆنیەتی حەوزەکە ﴾

درێژیەکەی ڕێڕەوی مانگێکە وە پانیەکەی ڕێڕەوی مانگێکە وەهەموو لایەکانی وەك یەك یەکسانن وەپەرداخەکانی وەکو ئەستێرەکانی ئاسمان وایە لەزۆریدا وە ئاوەکەی لە شیر سپیترە وە لە هەنگوین شیرینترە وە بۆنەکەی لە بۆنی میسك خۆشترە دوو پلوسكو بۆری تێدایە کە ئاوی لەبەهەشتەوە بۆدێنن یەکێکیان لە ئاڵتوونە ئەویتریان لە زیوە

---

[١] البخاري : كتاب الرقاق : باب في الحوض (٦٥٨٣),(٦٥٨٤).

ومسلم : كتاب الفضائل : باب إثبات حوض نبينا صلى الله عليه وعلى آله وسلم (٢٢٩٠)(٢٦), (٢٢٩١) (٢٦) من حديث سهل بن سعد وأبي سعيد الخدري رضى الله عنهما .

قال ابن أبي العز في شرح الطحاوية (١/ ٢٧٧):(( والأحاديث الواردة في ذكر الحوض تبلغ حد التواتر، رواها من الصحابة بضع وثلاثون صحابياً رضي الله عنهم ولقد استقصى طرقها شيخنا عماد الدين ابن كثير تغمده الله برحمته في آخر تاريخه الكبير المسمى بالبداية والنهاية ))أ.هـ . وكذا انظر فتح الباري (١١/ ٤٦٨,٤٦٩).

وقوله ﴿ إِنِّي فَرَطُكُمْ عَلَى الْحَوْضِ ﴾ . أي متقدمكم إليه النهاية لابن الثير (٣/ ٤٣٤).

باوەڕدارانی ئوممەتی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دێنە سەری و لێیدەخۆنەوە جاهەركەسێك قومێ ئاوی لێبخواتەوە لەدوای ئەوە هەرگیز تینووی نابێت وە هەموو ئەوانەی كە باسكرا جێگیرە لە هەردوو صەحیحی بوخاری یان یەكێكیانـدا[1] كەئەویش ئێستا بوونی هەیە لەبەر فەرمایشتەكەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم كەدەفەرمووێت :﴿ إِنِّي وَاللَّهِ لَأَنْظُرُ إِلَى حَوْضِي الْآنَ ﴾ رواه البخاري [2] واتە ﴿ والله ی من ئێستا تەماشای حەوزەكەم دەكەم ﴾.

ئەو ئاوەشی كەبۆی دێت و تێدەڕژێت لە ئاوی كەوسەری بەهەشتەوەیە لەبەر فەرمایشتەكەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم كەدەفەرمووێت : ﴿وَأَعْطَانِي الْكَوْثَرَ فَهُوَ نَهْرٌ مِنْ الْجَنَّةِ يَسِيلُ فِي حَوْضِي ﴾ رواه أحمد وهو حسن الإسناد والمتن [3].

واتە ﴿ وە كەوسەری پێبەخشیووم كەئەویش ڕووبارێكە لەبەهەشتدا دەڕژێتە ناو حەوزەكەمەوە ﴾.

---

١ البخاري : كتاب الرقاق : باب في الحوض ( ٦٥٧٩) .

ومسلم : إتاب الفضائل : باب إثبات حوض نبينا صلى الله عليه وعلى آله وسلم وصفاته (٢٢٩٢) (٢٧) .

من حديث عبدالله بن عمرو بن العاص رضي الله عنهما .

والبخاري : كتاب الرقاق : باب في الحوض ( ٦٥٨٠) .

ومسلم : إتاب الفضائل : باب إثبات حوض نبينا صلى الله عليه وعلى آله وسلم وصفاته ( ٢٣٠٣)(٤٣) من حديث أنس بن مالك رضي الله عنه.

ومسلم في المصدر نفسه (٢٣٠١)(٣٧). من حديث ثوبان رضي الله عنه.

٢ كتاب الرقاق : باب في الحوض ( ٦٥٩٠) .من حديث عقبة بن عامر رضي الله عنه.

٣ نهاية البداية والنهاية (٢/ ٢٤٤) وفي إسناده ابن لهيعة وهو ضعيف.

بۆ هەموو پێغەمبەرێك حەوزێك هەیە كە تایبەتە بەخۆیی و نەتەوەكەیەوە بەڵام حەوزەكەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم لەهەموویان گەورەترو مەزنترە وەزۆرترین كەسیش دێتە سەری ﴿ ئەمە بەڵگەیە لەسەرئەوەی كە ئوممەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم لەهەموو ئوممەتەكان زۆرترە – وەرگێڕ﴾

لەبەر فەرمایشتەكەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم كەدەفەرموویێت:

﴿إِنَّ لِكُلِ نَبِي حَوْضاً وَإِنَهُمْ لَيَتَباهَوْنَ أَيُهُمْ أَكْثَر وَارِدة وَإِنّي لَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَكْثَرَهُمْ وَارِدَةً﴾. رواه الترمذي وقال غريب وروى ذلك إبن أبي الدنيا وابن ماجة من حديث أبي سعيد وفيه ضعف لكن صححه بعضهم من أجل تعدد الطرق[1].

واته ﴿هەموو پێغەمبەرێك حەوزێكی هەیە، و ئەوان شانازی دەكەن كە كامیان زیاتر ژمارەی هاتوانی سەر حەوزەكەی زیاتر بێت، وەمن هیوام وایە كە هاتوانی سەر حەوزەكەم لە هەمویان زیاتر بێت ﴾[2].

---

[1] حديث صحيح : الترمذي (٢٤٤٣) منطريق الحسن عن سمرة وقال الترمذي : هذل حديث غريب.

قال الحافظ في الفتح (١١/ ٤٦٧) : (( وأشار أى –الترمذي –إلى أنه اختلف في وصله وإرساله ةأن المرسل أصح .

قلت : والمرسل أخرجه ابن أبي الدنيا بسندٍ صحيح عن الحسن قال : قال رسول الله عليه وعلى آله وسلم ﴿ إنَ لكل نبي حوضاً وهو قائم على حوضه بيده عصا يدعو من عرف من أمته، إلا أنهم يتباهون أيهم أثر تبعا، وإني لأرجو أن أكون أكثرهم تبعا ﴾ وأخرجه الطبراني من وجه آخر عن سمرة موصولاً ومرفوعاً مثله وفي سنده لين، وأخرج إبن أبي الدنيا أيضاً حديث أبي سعيد رفعه ﴿ وكل نبي يدعو أمته، ولكل نبي حوض، فمنهم من يأتيه الفئام ومنهم من يأتيه العصبة ومنهم من يأتيه الواحد ومنهم من يأتيه الإثنان ومنهم من لايأتيه أحد، وإني لأكثر الأنبياء تبعاً يوم القيامة ﴾ وفي إسناده لين . وإن ثبت فالمختص بنبينا عليه وعلى آله وسلم الكوثر الذي يصب من مائه في حوضه فإنه لم ينقل نظيره لغيره )) أ.هـ .

[2] ئامۆژگاری هەموو موسڵمانێكی دڵسۆز و ژیر دەكەم بۆ زیاتر شارەزابوون لە حەوزەكەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم بگەڕێنەوە بۆ پەرتووكی ﴿ قیامەت لە قورئان و فەرموودە صەحیحەكاندا ﴾ دانراوی مامۆستامان محمدی مەلا فائق شارەزووری خوا بیپارێزێت لەلاپەڕە ٢٦٦دەست پێدەكات تا لاپەڕە ٢٩٣ . ﴿ وەرگێڕ ﴾.

**والصِّراطُ حقٌّ يَجُوزُهُ الأَبْرارُ، ويَزِلُّ عنْهُ الفُجَّارُ.**

**وەباوەڕمان بەپردی صِّراط هەیە کـە هەقـەو ڕسـتە چـاکەکاران لێـی دەپەڕنـەوە وە خراپەکارانیش لـەسەری دەخلیسکێن و ناتوانن لێی بپەڕنەوە و دەکەونە ناو دۆزەخەوە**

**ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین**

**الـصِّراط : لەزمانەوانیـدا بـەواتای ڕێگـە دێـت، وەلەشـەرعدا بریتیـە لـە پردێکـی ڕاکێشراو بەسەر دۆزەخدا تاخەڵکی بەسەریدا بپەڕنەوە بۆ بەهەشت، کەئەوەش جـێگیرە بەبەڵگەی قورئان وسوننەت و وتەی پێشین .**

**خوای گـەورە دەفـەرموویێت : ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ﴾مريم: ٧١ واتـە ﴿ ئـەی خەڵکینـە ! ئـیلا دەبێـت هـەموو نزیکـی ئـاگری دۆزەخ ببنـەوە و بەسـەر پردەکـەی ﴿الصِّراط﴾دا تێپەڕن .**

**هەریەکە لـە عبـدالله ی کـوڕی مەسـعود وە قـەتادە وە زەیـدی کـوڕی ئەسـلەم بـە تێپەڕبوون بەسەر پردی ﴿الصِّراط ﴾دا لێکیان داوەتەوە، وەکۆمەڵێکی تر لـەوانە عبدالله ی کوڕی عەبباس ڕەزای خوا لـەهەمووان بێت بە ڕۆیشتنە ناو ئاگر لێکیانداوەتەوە بەڵام دوای چوونە ناوی ڕزگاریان دەبێت.**

**وە پێغەمبەری خوا صلى الله عليـه وعلـى آلـه وسـلم دەفـەرموویێت : ﴿ثُـمَّ يُـضْرَبُ الْجِسْرُ عَلَى جَهَنَّمَ وَتَحِلُّ الشَّفَاعَةُ وَيَقُولُونَ اللَّهُمَّ سَلِّمْ سَلِّمْ ﴾ متفق عليه[1] .**

---

[1] جزء من حديث أبي سعيد الخدري الطويل الذي أخرجه :

البخاري : كتاب التوحيد : باب قول الله تعالى ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴾ القيامة: ٢٢ (٧٤٣٩).

ومسلم : كتاب الإيمان : باب معرفة طريق الرؤية (١٨٣)( ٣٠٢).

* الجِسر : ڕێگە . شرح النووي لمسم (٢٩/٣).

⇦ ثـم مِـنْ بعـده عمـرُ – رضـي الله عنـه – لفـضْلِه وعَهْـدِ أَبـي بكـرٍ إليـه.
پاشان لـەدوای ئەو پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لیٚ بێت لـەبەر گەورەیەتیەكـەی و گفتـی پێشەوا ئەبو بەكریش بۆی .

⇦ ثم عثمانُ – رضي الله عنه – لتقْديم أهلِ الشُّورى له.
پاشان پێشەوا عوسمان ڕەزای خوای لیٚ بێت لـەبەر پێشخستنی لـەلایەن شوراوە.

⇦ ثم عليٌّ – رضي الله عنه – لفَضلِه، وإجماعِ أهلِ عصْرِه عليه.
پاشان پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لیٚ بێت لـەبەر گەورەیەتیەكەی وەكۆدەنگی خەڵكی سەردەمی خۆی لـەسەر دانانی وەك جێنشین.

⇦ وهؤلاءِ الخلفاءُ الرّاشدون المهديّون الذين قال رسـول الله – صـلى الله عليـه وسلم – فيهم «عَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ مِنْ بَعْدِي، عَضّوا عَلَيْهَـا بِالنّوَاجِذِ»[1] .

وە ئەوانە خەلیفەی ڕاشیدو ڕێنمویی كراوان ئەوانەی پێغەمبەری خوا صـلى الله عليـه وعلـى آلـه وسـلم دەربارەیـان دەفـەرموویٚت ﴿ دەسـت بەڕیوشـوێنی مـن و جێنـشینە پێگەیشتوو ڕێنویكراوەكانی منەوە بگرن لە دوای من، بـە خرێكانتـان تونـد قـەپی پێـدا بكەن ﴾.

---

[1] فەرموودەیەكی صەحیحە :
پێشەوا ئەحمەد بە موسنەددا بەژمارە (١٢٦,١٢٧/٤ ) ڕیوایەتی كردووە .
وە ئەبوداودیش لـە كتاب السنة : باب في لزوم السنة بەژمارە ( ٤٦٠٧ ) ڕیوایەتی كردووە.
وە ترمزیش لـە كتاب العلم : باب ماجاء في الأخذ بالسنة وإجتناب البدعة بەژمارە ( ٢٦٧٦ ).
وە ئیبن و ماجەش لـە پێشەكیدا :باب إتباع السنة الخلفاء الراشدين المهدين بەژمارە ( ٤٢,٤٣) ڕیوایـەتیكردووە، وە الـدارمي (١/ ٤٤)، وغـبن حـبان (١٠٢ –المـوارد )، والحـاكم (٩٧/١) وغـبن أبـي عاصـم في الـسنة ( ص ١٧: ٢٠,٢٩,٣٠)، والبيهقي في دلائل النبوة (٦/ ٥٤١) وابن عبدالبر في جامع بيـان العلـم وفـضله ( ١/ ٢٢٢:٢٢٤)، من حديث العرباض بن سارية أبي نجيح رضي الله عنه، وقد صححه غير واحد من أهل العلم : فقال الترمذي ﴿ حسن صحيح ﴾ وصححه الحاكم وأقره الذهبي، ونقل ابن عبدالبر عن أبي بكر احمد احمد بن عمـرو البـزار قولـه ﴿ حـديث العرباض في الخلفاء الراشدين صحيح ثابت ﴾ ثم قال : وهو كما قال، وصححه شيخ الإسلام ابن تيمية في غير موضع ( ٣٠٩/٢٠) مجموع الفتاوى وفي اقتضاء الصراط المستقيم ( ٢/ ٥٧٦)، أما تصحيح الألباني الذي أشار اليـه الـشيخ ففي صحيح الجامع الصغير ( ٢/ ٣٤٦) وفي تخريج السنة لابن أبي عاصم ص (١٧:٢٠)، ص (٢٩, ٣٠).

وقال صلى الله عليه وسلم «الخِلاَفَةُ مِنْ بَعْدِي ثَلاَثُونَ سَنَةً»[١] فكان آخرُها خلافةَ علي – رضي الله عنه.

وە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرمووێت ﴿ جێنشینی دوای من سی ساڵە جادوا هەمین جێنشینایەتی جێنشینیەتی پێشەوا عەلی بوو ڕەزای خوای لێ بێت﴾.

**تێبینی وەرگێڕ : ئەم وتەیەی دالەر هەڵەیە خوا لێی خۆش بێت چونکە دوا جێنشین حەسەنی کوڕی عەلی بوو ڕەزای خوا لەهەردووکیان بێت لەبەرئەوەی بەو چوار خەلیفەیە بیست ونۆ ساڵ و شەش مانگ فەرمانڕەوایەتیان کرد و شەش مانگەکەی تریش لەلایەن حەسەنەوە بوو وەك موعجیزەیەك بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم کەفەرمووی خیلافەت دوای من سی ساڵ دەبێت وەفەرمووی ئەم کوڕەی من سەیدەو خوای گەورە لەسەر دەستیدا ئاشتەوای دەخاتە نێوان دوو کۆمەڵی گەورەی موسڵمانانەوە کە کۆمەڵی عەلی و کۆمەڵی موعاویە بوو ڕەزای خوا لەهەردووکیان بێت ئەوەبوو ئەو نەبەردە وازی لە جێنشینی هێنا بۆ موعاویە ڕەزای خوا لەهەردووکیان بێت تا ئاژاوە لە نێوان موسڵماناندا ڕوونەدات و ئاشتەوای لە نێوان موسڵماناندا بەر پابێت ﴿ وەرگێڕ ﴾ .**

---

[١] حديث صحيح : أخرجه أبو داود ( ٤٦٤٦)، (٤٦٤٧)، والترمذي وحسنه، والنسائي في فضائل الصحابة (٥٢) والحاكم ( ٣/ ٧١, ١٤٥) وصححه ووافقه الذهبي . وأحمد في مسنده (٥/ ٢٢٠, ٢٢١ ) وفي فضائل الصحابة (٧٨٩, ٧٩٠، ١٠٢٧) وابن حبان (١٥٣٤، ١٥٣٥) وابن أبي عاصم في السنة (٢/ ٥٦٢) والطبراني في الكبير (١٣/ ١٣٦، ٦٤٤٢) والطيالسي (١١٠٧) والبيهقي في دلائل النبوة (٦/٣٤) من طرق عن سفينة أبي عبدالرحمن مولى رسول الله صلى الله عليه وعلى آله وسلم به . وإسناده حسن وله شواهد ترفعه إلى مرتبة الصحيح لغيره ولذا صححه وقواه غير واحد من أهل العلم منهم الإمام أحمد والترمذي وابن جرير الطبري وابن أبي عاصم وابن حبان والحاكم وابن تيمية والذهبي والحافظ ابن حجر العسقلاني وراجع الصحيحة للألباني في بحث جيد (٤٥٩) للرد على من ضعف الحديث.




## ﴿فضائل الصحابة﴾

صـەحابی ئـەو کەسـەیە کەبـە پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وعلـی آلـه وسـلم گەیشتبێتو باوەڕی پێ هێنابێت و لەسەر ئەو باوەڕەش مردبێت.

وەهاوەڵەکانی پێغەمبەری خوا صـلی الله علیـه وعلـی آلـه وسـلم باشـترین هـاوەڵی پێغەمبەرانن سەلامی خوایان لێ بێت لەبەر فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیـه وعلی آله وسلم کەدەفەرمووێت : ﴿خَیْـرُ النَّـاسِ قَرْنِـی ﴾[1] واتـە ﴿ باشـترینی خـەڵك خەڵکی سەردەمی منن (( ئەوانەی باوەڕیان هێناوە – وەرگێڕ )) ﴾ فەرموودەکە پێشەوا بوخاری و جگە لەویش ڕیوایەتیان کردووە.

وەباشترینی هاوەڵانیش کۆچـکەرانن لەبـەر کۆکردنـەوەیان لـەنێوان کۆچـکردن و سەرخستندا پاشان ئەنصارە واتە یاریدەدەرەکان .

وە باشـترینی کۆچـکەرەکانیش هەرچـوار جێنـشینە ڕێنمویکراوەکـەن کەئـەوانیش ﴿ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان و عەلی ﴾ن.

---

[1] البخاري : كتاب فضائل أصحاب النبي صلى الله عليه وعلى آله وسلم : بـاب فـضائل أصـحاب النبي صلى الله عليه وعلى آله وسلم ( ٣٦٥١).

ومسلم : كتاب فضائل الصحابة : باب فضل الصحابة ثم الـذين يلـونهم .. ( ٢٥٣٢) (٢١٢) مـن حديث إبن مسعود رضي الله عنه وفي البـاب عـن عمـران بـن حـصين : عنـد البخـاري ( ٢٥٦١)( ٣٦٥٠) ( ٦٤٣٨) (٦٦٩٥) ومسلم (٢٥٣٥) وعن أبـي هريـرة رضـي الله عنـه : عنـد مـسلم : (٢٥٣٤)(٢١٢) . وغيرهم .

وهو حديث متواتر صرح بتواتره الحافظ ابن حجر في مقدمة الإصابة .

جا ئەبوبەکر ڕاستگۆکەیە: ناوی عبدالله ی کوڕی عوسمانی کوڕی عامرە لــە نـەوەی تەمیمی کوڕی موڕەی کوڕی کەعبە، یەکەم کەسە باوەڕی بە پێغەمبەری خوا صـلی الله علیه وعلی آله وسلم هێناوە لـە پیاوانـدا وە هاوڕییـەتی کـرد لـەکاتی کۆچـکردندا بـۆ شاری مەدینە وە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم کردی بە جێگری خۆی لە نوێژکردن و حەجکردندا وەجێنشینیەتی لەناو ئوممەتەکەیـدا، لەسـەر دەسـتیدا پێـنج لەوانەی موژدەی بەهەشتیان پێدراوە موسڵمان بوون کەئەوانیش ﴿ عوسمـان و زوبـەیرو تەڵحەو عبدالرحمانی کوڕی عەوفو سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص﴾ ن، لەجەمادی کۆتایی ساڵی ٢٣کۆچیدا لـەتەمەنی ٦٣ساڵیدا مردووە، وەئەو پێنجە لەگـەڵ ئەبوبـەکر و عـەلی کوڕی ئەبی تاڵیب و زەیدی کوڕی حاریسە کەدەکاتە هەشت ئەوانەن کەلەپێش هـەموو کەسێکەوە موسڵمان بوون . ابن إسحاق ووتویەتی واتە لەپیاواندا لــەدوای نێردرانــی و بوون بەپێغەمبەر صلی الله علیه وعلی آله وسلم.

وەعومەریش ڕەزای خوای لێ بێت : ناوی باوکی حەفصە نازنـاوی فاروقـە عومـەری کـوڕی خـەتتاب لەنــەوەی عـەدی کـوڕی کـەعبی کـوڕی لوئەیـە، لەسـاڵی شەشـی پێغەمبەرایەتیدا موسڵمان بووە لەدوای نزیکەی چل پیاو و یانزە ئافرەت جا موسڵمانان زۆر دڵخۆش بوون بەموسڵمان بوونی وەلەدوای موسڵمان بوونی ئیـسلام لەمەککـەدا ئاشکرا بوو، پێشەوا ئەبوبەکر کردی بەجێنـشینی خـۆی بەسـەر ئوممەتـەوە جـا هەڵـسا بەهەڵگرتنی باری قورسی جێنشینایەتی بەباشترین شێوە تا ئەو کاتەی کـوژرا بەشـەهیدی لەمانگی ذی الحجة لەساڵی ٢٣کۆچی لەتەمەنی ٦٣ ساڵیدا .

وە عوسمانیش کونیەکەی بـاوکی عبـدالله یـە نازنـاوی زوننورەینـە عوسمـانی کـوڕی عەففان لەنەوەی ئومەیەی کوڕی عبدالشمسی کوڕی عبدمناف، موسڵمان بـووە پـێش چوونی پێغەمبەری خوا صـلی الله علیـە وعلـی آلـە وسـلم بـۆ مـاڵی ئەرقـەم، پیـاوێکی دەوڵەمەندو بەخشیندە بوو لەدوای عومەری کوڕی خەتتاب جێنشینایەتی گرتـە دەسـت

بەکۆدەنگی ئەهلی ڕاویژ تا ئەو کاتەی کوژرا بەشەهیدی لە ذی الحجة لەسالّی ٣٥ کۆچی لەتەمەنی ٩٠ سالّیدا لەسەر یەکێك لەقسەکان .

وەعەلیش : ناوی باوکی حەسەن عەلی کوڕی ئەبی تالّیبە وەناوی ئەبو تالّیبیش عبدمناف کوڕی عبدالموتەلّیبە یەکەم کەسە موسلّمان بووە لە مندالّاندا ، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم لەڕۆژی خەیبەردا ئالّاکەی دایە دەستی جاخوای گەورە لەسەردەستی ئەودا ئەو شوێنەی ڕزگارکرد، وەبەیعەتی پێدرا بۆ جێنشینایەتی لەدوای شەهیدکردنی پێشەوا عوسمان ڕەزای خوایان لیّ بێت جائەو جێنشینی ڕەوابوو تائەو کاتەی کوژرا بەشەهیدی لەڕەمەزانی سالّی ٤٠ کۆچی لەتەمەنی ٦٣ سالّیدا.

وەباشترینی ئەو چوارەش ئەبوبەکرە پاشان عومەر پاشان عوسمان پاشان عەلیە ڕەزای خوایان لیّ بێت لەبەرفەرموودەکەی عبدالله ی کوڕی عومەر ڕەزای خوایان لیّ بێت : ﴿كُنَّا نُخَيِّرُ بَيْنَ النَّاسِ فِي زَمَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَنُخَيِّرُ أَبَا بَكْرٍ ثُمَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ثُمَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ﴾ [١]رواه البخاري واتە ﴿ ئێمە لەنێوان خەلّکیدا کەسانێکمان هەلّدەبژراد لەسەردەمی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم جا ئەبوبەکرمان هەلّدەبژارد پاشان عومەری کوڕی خەتتاب پاشان عوسمانی کوڕی عەففان﴾ وەلەبەر فەرموودەکەی ئەبو داود ﴿كنَّا نقولُ ورسول الله – صلى الله عليه وسلم – حيٌّ: أَفْضَلُ هذه الأمّة بعْدَ نبيّها أبو بكرٍ، ثمَّ عمرُ، ثم عثمانُ﴾.

---

١ البخري : كتاب فضائل الصحابة : باب فضل أبي بكر بعد النبي صلى الله عليه وعلى آله وسلم (٣٦٥٥) وفي للفظ للبخاري ( ٣٦٩٧) : :﴿ كنا في زمن النبي صلى الله عليه وعلى آله وسلم لا نعدل بأبي بكر أحداً ثم عمر ثم عثمان ثم نترك أصحاب النبي صلى الله عليه وعلى آله وسلم لانفاضل بينهم ﴾.

واتە ﴿ ئێمە لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم زیندوو بوو دەمانووت باشترینی ئەم ئوممەتە لەدوای پێغەمبەرەکەی صلى الله عليه وعلى آله وسلم ئەبوبەکرە پاشان عومەر پاشان عوسمان ﴾.

پێشەوا تەبەڕانی زیادەیەکی هێناوە لە ڕیوایەتەکەیدا : ﴿فيسمع ذلك النبيَّ – صلى الله عليه وسلم – فلا يُنْكرُه ﴾ واتە ﴿جائەوقسەیەی ئێمە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەیبیست ئەویش ئینکاری نەدەکرد واتە بێدەنگ دەبوو لێی ﴾ من ئەو دەربڕیەنم نەمبینیوە دانەر باسی زیادەیەی عەلی کوڕی ئەبوتالیبی تیداکردووە [1].

وەشایستەترینیان بە جێنشینایەتی لەدوای پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وعلى آله وسلم ئەبوبەکری صدیق بوو ڕەزای خوای لێ بێت لەبەرئەوەی ئەو باشترینیانە وەلەپێش هەموویشیانەوە موسڵمان بووە وەلەبەرئەوەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم پێشی خستن لەنوێژدا و پێشنوێژی کرد وەلەبەر کۆدەنگی هاوەڵان لەسەر پێشخستنی و بەیعەت پێدانی، وەخوای پەروەردگار ناگونجێت ئەو هاوەڵە بەڕێزانە کۆبکاتەوە لەسەر گومڕایی، پاشان لەدوای ئەو پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێت لەبەرئەوەی باشترینی هاوەڵان بوو لەدوای پێشەوا ئەبوبەکر وەلەبەر گفتی پێشەوا ئەبو بەکریش بۆی کەبکرێتە جێنشین، پاشان عوسمانە ڕەزای خوای لێ بێت لەبەر

[1] إسناد صحيح : أبوداود (٤٦٢٨) والترمذي (٣٧٠٧) وابن أبي عاصم في السنة (١١٩٠) وإسناده صحيح كما قال الألباني في تخريج السنة (٢/ ٥٦٧).

وأما الزيادة التي ذكرها الشيخ العثيمين عند الطبراني وهي : ﴿فيسمع ذلك النبيَّ – صلى الله عليه وسلم – فلا يُنْكرُه﴾ فهي زيادة صحيحة ثابتة من طرق كثيرة عند وابن أبي عاصم في السنة (١١٩٤، ١١٩٥, ١١٩٦، ١١٩٧ ) وأحمد (٢/ ١٤) وغيرهم وغيرهم بأسانيد صحيحة وراجع تخريج السنة لإبن أبي عاصم (٢/ ٥٦٨, ٥٦٩) وكذا في الفتح ( ٧/ ١٦, ١٧) .

گەورەیەتیەکەی وە پێشخستنی لەلایەن ئەهلی ڕاویژەوە بۆکردنی بە جێنشین، وەئەوانە باسکراون لەم دێڕە هۆنراوەدا:

علي وعثمان وسعد وطلحة ............ زبير وذو عوف رجال المشهورة

پاشان عەلی ڕەزای خوای لێ بێت لەبەر گەورەیەتیەکەی و کۆدەنگی خەڵکی سەردەمی خۆی لەسەری بۆ دانانی بە جێنشین .

وە ئەوانە خەلیفەی ڕاشیدو ڕێنمویی کراوان ئەوانەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەربارەیان دەفەرموویت : «عَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ مِنْ بَعْدِي، عَضّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ»[١]

واتە :﴿ دەست بەڕیوشوێنی من و جێنشینە پێگەیشتوو ڕێنویکراوەکانی منەوە بگرن لە دوای من، بە خرێکانتان توند قەپی پێدا بکەن ﴾.

وە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرموویت «الخِلاَفَةُ مِنْ بَعْدِي ثَلاثُونَ سَنَةً» واتە : ﴿ جێنشینی دوای من سی ساڵە جادوا هەمین جێنشینایەتی

---

١ فەرمودەیەکی صەحیحە: پێشەوا ئەحمەد بە موسنەددا بەژمارە (١٢٦,١٢٧/٤ ) ڕیوایەتی کردووە.
ئەبوداودیش لە كتاب السنة : باب في لزوم السنة بەژمارە ( ٤٦٠٧ ) ڕیوایەتی کردووە.
ترمزیش لە كتاب العلم : باب ماجاء في الأخذ بالسنة وإجتناب البدعة بەژمارە ( ٢٦٧٦ ).
ئیبنو ماجەش لە پێشەکیدا :باب إتباع السنة الخلفاء الراشدين المهدين بەژمارە ( ٤٢,٤٣) ڕیوایەتیکردووە، وە الدارمي (١/ ٤٤)، وغبن حبان (١٠٢ –الموارد )، والحاكم (٩٧/١) وغبن أبي عاصم في السنة ( ص ١٧: ٢٠,٢٩,٣٠)، والبيهقي في دلائل النبوة (٦/ ٥٤١) وابن عبدالبر في جامع بيان العلم وفضله ( ١/ ٢٢٢:٢٢٤)، من حديث العرباض بن سارية أبي نجيح رضي الله عنه، وقد صححه غير واحد من أهل العلم : فقال الترمذي ﴿ حسن صحيح ﴾ وصححه الحاكم وأقره الذهبي، ونقل ابن عبدالبر عن أبي بكر أحمد أحمد بن عمرو البزار قوله ﴿ حديث العرباض في الخلفاء الراشدين صحيح ثابت ﴾ ثم قال : وهو كما قال، وصححه شيخ الإسلام ابن تيمية في غير موضع ( ٣٠٩/٢٠) مجموع الفتاوى وفي اقتضاء الصراط المستقيم ( ٢/ ٥٧٦)، أما تصحيح الألباني الذي أشار اليه الشيخ ففي صحيح الجامع الصغير ( ٢/ ٣٤٦) وفي تخريج السنة لابن أبي عاصم ص (١٧:٢٠)، ص (٢٩, ٣٠).

جێنشینیەتی پێشەوا عەلی بوو ڕەزای خوای لێ بێت﴾ پێشەوایان ئەحمەدو ئەبوداود ترمزی ڕیوایەتیان کردووە پێشەوا ئەلبانی فەرموویەتی : وە ڕشتەکەی حەسەنە .

جادوا جێنشین عەلی بوو دانەر ئاوای فەرمووە هەروەکو بڵێی جێنشینایەتی حەسەنی کردبێتە پاشکۆیەك بۆ باوکی یان وای داینەنابێت بەجۆرێ ئەو ڕەزای خوای لێ بێت دەستی لێهەڵگرت بۆ موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ڕەزای خوایان لێ بێت .

- جا جێنشینایەتی ئەبوبەکر ڕەزای خوای لێ بێت دوو ساڵ و سێ مانگ و نۆ شەو بوو لە ١٣ی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی ١١کۆچی تا ٢٢ی جەمادی ئاخیری ساڵی ١٣ی کۆچی.
- وە جێنشینایەتی عومەر ڕەزای خوای لێ بێت ١٠ ساڵ و شەش مانگ و سێ ڕۆژبوو لە ٢٢ی جەمادی ئاخیری ساڵی ١٣ی کۆچی تا ٢٦ ذی الحجة لەساڵی ٢٣کۆچی .
- وە جێنشینایەتی عوسمان ڕەزای خوای لێ بێت ١٢ ساڵ بوو تەنها ١٢ڕۆژ نەبێت لە١ی موحەڕەمی ساڵی ٢٤ی کۆچی تا ١٨ی ذی الحجة لەساڵی ٣٥کۆچی .
- جێنشینایەتی عەلی ڕەزای خوای لێ بێت ٤ساڵ و ٩مانگ بوو لە ١٩ی ذی الحجة لەساڵی ٣٥کۆچی تا ١٩ی ڕەمەزانی ساڵی ٤٠ی کۆچی .

جا کۆی هەموو ئەو چوار جێنشینە ٢٩ ساڵ و ٦ مانگ و ٤ڕۆژ بوو ، پاشان بەیعەتدرایە حەسەنی کوڕی عەلی ڕەزای خوایان لێ بێت لەو ڕۆژەی باوکی تیایدا شەهید بوو عەلی کوڕی ئەبو تالیب ڕەزای خوای لێ بێت وەلە ڕەبیعی یەکەمی ساڵی ٤١ی کۆچی کاروباری جێنشینایەتی ڕادەستی موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ڕەزای خوایان لێ بێت کرد وەبەوەش موعجیزەکەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم ئاشکرا بوو کە دەفەرموێت «الخِلاَفَةُ مِنْ بَعْدِي ثَلاَثُونَ سَنَةً» واتە : ﴿ جێنشینی دوای من سی ساڵە جادوا هەمین جێنشینایەتی جێنشینیەتی پێشەوا عەلی بوو ڕەزای خوای لێ بێت﴾ وە فەرمایشتەکەیشی دەربارەی حەسەنی کوڕی عەلی ڕەزای خوایان لێ بێت کە دەفەرموێت ﴿إِنَّ ابْنِي هَـذَا سَيِّدٌ وَلَعَلَّ اللَّـهَ أَنْ يُصْلِحَ بِهِ بَيْنَ فِئَتَيْنِ عَظِيمَتَيْنِ مِنْ

الْمُسْلِمِينَ﴾ . رواه البخاري [١] واته ﴿ ئـەم كـوڕەی مـن گەورەيـە وە بـەهيوای ئـەوەی خوای گەورە بەهۆيەوە ئاشتەوايەتی بخاتە نێوان دوو كۆمەڵی گەورەوە لە موسڵمانان﴾.

حەسەنی كوڕی عەلی ڕەزای خوايان لێ بێت كـچەزای پێغەمبـەری خوايـە صـلى الله عليه وعلى آله وسلم وە ڕێحانەيەتی وەئەو ئەميری باوەڕداران كوڕی ئەميری باوەڕداران عەلی كوڕی ئەبو تاڵيبە لـە ١٥ی ڕەمـەزانی سـاڵی ٣ی كۆچـی وە لـەشـاری مەدينـەی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وعلى آله وسلم مردووە و لـە بەقيعدا نێـژراوە لـەسـاڵی ٥٠ ی كۆچيدا .

وەحوسەينيش ڕەزای خوای لێ بێت كچەزای پێغەمبەری خوايە صلى الله عليه وعلـى آله وسلم وە ڕێحانەيەتی وەئەويش كوڕی عەلی كوڕی ئەبو تاڵيبە ڕەزای خوای لێ بێـت لـەمانگی شەعبانی ساڵی ٤ی كۆچيدا لـەدايك بووە و لـە كەربەلا لـە ١٠ی موحـەڕەمی ساڵی ٦١ی كۆچيدا كوژراوە، وەسابتيش كەئـەويش كـوڕی قەيـسە كـوڕی شەماسـی ئەنصاری خەورەجيە ووتاربێژی ئەنصار لـەڕۆژی يەمامەدا بەشەهيدی كوژرا لـە كۆتـايی ساڵی ١١ی كۆچی يان لـەسەرەتای ساڵی ١٢ی كۆچی .

---

١ البخاري : متاب الصلح : باب قول النبي صلى الله عليه وعلى آلـه وسـلم للحسن بـن علـى .... (٢٧٠٤ ) مـن حديث أبي بكرة رضي الله عنه ضمن رواية مطولة .

تەواوی فەرموودەكە بەم شێوەيە :

٢٧٠٤ – حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ سَمِعْتُ الْحَسَنَ يَقُولُ اسْتَقْبَلَ وَاللَّهِ الْحَسَنُ بْـنُ عَلِيٍّ مُعَاوِيَةَ بِكَتَائِبَ أَمْثَالِ الْجِبَالِ فَقَالَ عَمْرُو بْنُ الْعَاصِ إِنِّي لَأَرَى كَتَائِبَ لَا تُوَلِّي حَتَّى تَقْتُلَ أَقْرَانَهَـا فَقَـالَ لَـهُ مُعَاوِيَـةُ وَكَانَ وَاللَّهِ خَيْرَ الرَّجُلَيْنِ أَيْ عَمْرُو إِنْ قَتَلَ هَؤُلَاءِ هَؤُلَاءِ وَهَؤُلَاءِ هَؤُلَاءِ مَنْ لِي بِأُمُورِ النَّـاسِ مَـنْ لِـي بِنِسَـائِهِمْ مَـنْ لِـي بِضَيْعَتِهِمْ فَبَعَثَ إِلَيْهِ رَجُلَيْنِ مِنْ قُرَيْشٍ مِنْ بَنِي عَبْدِ شَمْسٍ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ سَمُرَةَ وَعَبْدَ اللَّهِ بْـنَ عَـامِرِ بْـنِ كُرَيْـزٍ فَقَـالَ اذْهَبَا إِلَى هَذَا الرَّجُلِ فَاعْرِضَا عَلَيْهِ وَقُولَا لَهُ وَاطْلُبَا إِلَيْهِ فَأَتَيَاهُ فَدَخَلَا عَلَيْهِ فَتَكَلَّمَا وَقَالَا لَهُ فَطَلَبَا إِلَيْهِ فَقَالَ لَهُمَـا الْحَسَـنُ بْنُ عَلِيٍّ إِنَّا بَنُو عَبْدِ الْمُطَّلِبِ قَدْ أَصَبْنَا مِنْ هَذَا الْمَالِ وَإِنَّ هَذِهِ الْأُمَّةَ قَدْ عَاثَتْ فِي دِمَائِهَا قَالَا فَإِنَّـهُ يَعْـرِضُ عَلَيْـكَ كَـذَا وَكَذَا وَيَطْلُبُ إِلَيْكَ وَيَسْأَلُكَ قَالَ فَمَنْ لِي بِهَذَا قَالَا نَحْنُ لَكَ بِهِ فَمَا سَأَلَهُمَا شَيْئًا إِلَّا قَالَا نَحْـنُ لَـكَ بِـهِ فَـصَالَحَهُ فَقَـالَ الْحَسَنُ وَلَقَدْ سَمِعْتُ أَبَا بَكْرَةَ يَقُولُ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الْمِنْبَرِ وَالْحَسَنُ بْـنُ عَلِـيٍّ إِلَـى جَنْبِـهِ وَهُوَ يُقْبِلُ عَلَى النَّاسِ مَرَّةً وَعَلَيْهِ أُخْرَى وَيَقُولُ إِنَّ ابْنِي هَذَا سَـيِّدٌ وَلَعَـلَّ اللَّـهَ أَنْ يُـصْلِحَ بِـهِ بَـيْنَ فِئَتَـيْنِ عَظِيمَتَـيْنِ مِـنْ الْمُـسْلِمِينَ قَـالَ أَبُـو عَبْـد اللَّـهِ قَـالَ لِـي عَلِـيُّ بْـنُ عَبْـدِ اللَّـهِ إِنَّمَـا ثَبَـتَ لَنَـا سَـمَاعُ الْحَسَنِ مِـنْ أَبِـي بَكْـرَةَ بِهَـذَا الْحَدِيثِ.﴿وەرگێڕ﴾.

⇦ ونَشْهَدُ للعشَرةِ بالجنّةِ، كما شَهِدَ لهم النبي – صلى الله عليه وسلم – فقال «أبُو بَكْرٍ فِي الجَنَّةِ، وعُمَرُ فِي الجَنَّةِ، وعُثْمَانُ في الجَنَّةِ، وعَلِيٌّ في الجنّةِ، وطَلْحَةُ فِي الجَنَّةِ، والزُّبَيْرُ فِي الجَنَّةِ، وسَعْدٌ فِي الجَنَّةِ، وسَعِيدٌ في الجنّةِ، وعبدُ الرّحمنِ بنُ عوفٍ في الجنّةِ، وأبُو عُبَيْدَةَ بنُ الجَرَّاحِ في الجَنَّةِ».

وەشاهێدی دەدەین بۆ ئەو دەکەسەی کە پێغەمبەری خودا صلی الله علیه وعلی آله وسلم شاهێدی بۆداون بەوەی بەهەشتین وەلەبارەیانەوە فەرموویەتی :﴿ ئەبوبەکر لەبەهەشتدایە، وە عومەر لەبەهەشتدایە، وەعوسمان لەبەهەشتدایە، وە عەلی لەبەهەشتدایە، وە طەڵحە لەبەهەشتدایە، وە زوبەیر لەبەهەشتدایە، وەسەعد لەبەهەشتدایە، وەسەعید لەبەهەشتدایە، وە عبدالرحمانی کوڕی عەوف لەبەهەشتدایە, وە ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح لەبەهەشتدایە .

⇦ وكُلُّ مَنْ شَهِدَ له النبيُّ – صلى الله عليه وسلم – بالجنَّةِ شَهِدْنَا له بها، كقوله«الحَسَنُ والحُسَيْنُ سَيِّدَا شَبَابِ أَهْلِ الجَنَّةِ»، وقولِه لثابتٍ بنِ قيْسٍ«إنَّهُ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ».

هەموو ئەوانەی کە پێغەمبەری خودا صلی الله علیه وعلی آله وسلم شاهێدی بۆداون بەوەی بەهەشتین ئێمەیش شاهیدی بۆ دەدەین بەوەی بەهەشتیە هەروەکو دەفەرموێت:
﴿ حەسەن و حوسەین گەورەی گەنجەکانی ئەهلی بەهەشتن ﴾، وەفەرمایشتەکەی دەربارەی سابتی کوڕی قەیس بەوەی کە (( ئەو لە ئەهلی بەهەشتە )) .

⇦ ولا نَجْزِمُ لأحدٍ مِنْ أهلِ القِبْلَةِ بجنَّةٍ ولا نَارٍ إلاَّ مَنْ جَزَمَ لَهُ الرّسول – صلى الله عليه وسلم –، لَكِنَّا نَرجو للمُحْسِنِ ونَخَافُ على المُسيءِ.

بۆ هیچ کەسێك لەئەهلی قیبلە بڕیاری دڵنیایی نادەین بەوەی بەهەشتیە وە بۆهیچ کەسێك لەئەهلی قیبلە بڕیاری دڵنیایی نادەین بەوەی دۆزەخیە تەنها بۆ کەسانێك نەبێت پێغەمبەری خودا صلی الله علیه وعلی آله وسلم بڕیاری دڵنیایی داوە بەوەی بەهەشتیە یان دۆزەخیە، بەڵام ئاواتە خوازی ئەوەین بەهەشت بەنسیبی کەسانێك بێت چاکەکارن و دەشترسین لەتاوانباران دۆزەخی بن.




## ﴿ شاهێدی دان بۆ کەسێك بەوەی بەهەشتیە یان دۆزەخیە ﴾

شاهێدی دان بەوەی کەسێك بەهەشتیە یان دۆزەخیە بۆ عـەقڵ و ژیـری نیـە دەسـتی تێوەربدات چونکە ئەو باسە وەستێنراوە لـەسەر شەرع بەجۆرێ ئەگەر شـەرع شـاهێدی بەوە بۆ دابێت ئێمەش شاهێدی بۆ دەدەین وەهەرکەسێکیش شەرع شاهێدی بۆ نـەدابێت ئێمەش شاهێدی بۆ نادەین بەڵام ئاواتە خوازین بەهەشت بۆکەسانێکی چـاکەکار بێـت و دەشترسین دۆزەخ بۆ کەسانێکی خراپەکار بێت .

وە شاهێدی دان بـەوەی کەسـێك بەهەشـتیە یـان دۆزەخیـە دابـەش دەبێـت بـەدوو بەشەوە:

## ﴿ بەشێوەیەکی گشتی وە بەشێوەیەکی تایبەتی ﴾

**جا ئەوەی دەربارەی گشتیەکەیە** : ئەوە وابەستەیە بە وەسفەوە بۆنمونـە کـە شـاهێدی بدەین بۆ هەموو باوەڕدارێك بەوەی ئەهلی بەهەشتەو بەهەشتیە یان شـاهێدی بـدەین بـۆ هەموو بێ باوەڕدارێك بەوەی ئەهلی دۆزەخـە و دۆزەخیـە یـان هاوشـێوەی ئـەوە لـەو وەسفانەی کە شەرع کردویەتی بە هۆکارێك بۆ چوونە نـاو بەهەشـت یـان چـوونە نـاو دۆزەخ .

**وەدەربارەی تایبەتیەکە**: ئەوە وابەستەیە بەکەسێکەوە : بۆنمونە کە شاهێدی بدەین بـۆ کەسێکی دیاریکراو بوەی بەهەشتیە یان بۆ کەسێکی دیاریکراو بەوەی دۆزەخیە جائێمـە هیچ کەسێك دیاری ناکەین بـەوەی بەهەشـتیە یـان دۆزەخیـە تـەنها کەسـانێك نـەبێت کەخوای گەورە یان پێغەمبەری خودا صلی الله علیە وعلی آلە وسـلم شـاهێدی بـۆداون بەوەی بەهەشتین و دیاریان کردووە .

## ﴿ ئەوانەی دیاریکراون لەئەهلی بەهەشت ﴾

ئەوانەی دیاریکراون لەئەهلی بەهەشتن زۆرن لەوانە : ئەو دە کەسەی مـوژدەی بەهەشتیان پێدراوە وە تایبەتکراون بەو وەسفە لەبەرئـەوەی پێغەمبـەری خـودا صـلى الله عليه وعلى آله وسلم کۆیکردونوتەوە لەیەك فەرمووددا جا فەرموویەتی : ﴿أَبُو بَكْرٍ فِي الْجَنَّةِ ، وَعُمَرُ فِي الْجَنَّةِ ، وَعُثْمَانُ فِي الْجَنَّةِ ، وَعَلِيٌّ فِي الْجَنَّةِ ، وَطَلْحَةُ فِي الْجَنَّةِ ، وَالزُّبَيْرُ فِي الْجَنَّةِ ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ فِي الْجَنَّةِ ، وَسَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ فِي الْجَنَّةِ ، وَسَعِيدُ بْنُ زَيْدٍ فِي الْجَنَّةِ ، وَأَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ فِي الْجَنَّةِ﴾ رواه الترمذي وصححه الألباني [1].

واتە :﴿ ئەبوبەکر لەبەهەشتدایە، وە عومەر لەبەهەشتدایە، وەعوسمـان لەبەهەشـتدایە، وە عـەلی لەبەهەشـتدایە، وە طـەڵحـە لەبەهەشـتدایە، وە زوبـەیر لەبەهەشـتدایە، وە عبدالرحمانی کوڕی عەوف لەبەهەشتدایە, وەسەعدی کوڕی ئەبی وەقاص لەبەهەشتدایە، وەسەعیدی کوڕی زەید لەبەهەشتدایە، وە ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح لەبەهەشتدایە .

لەوەی ڕابورد لـە پێـشەوە قـسە لەسـەر چـوار خەلیفـە ڕاشـیدەکانکرا وەهەرچـی دەربارەی ئەوانەی ترە ئەوا کۆبوونەتەوە لەم دێڕە هۆنراوەدا:

سعيد وسعد وابن عوف وطلحة ......... وعامر فهر والزبير المُمَدَّحُ

---

[1] حديث صحيح : أخرجه أبوداود (٤٦٤٩)، (٤٦٥٠) والترمذي ( ٣٧٤٨) و (٣٧٥٧) وابن ماجة (١٣٤) وأحمد (١/ ١٨٧, ١٨٨, ١٨٩) وفي فضائل الصحابة (٨٧, ٩٠, ٢٢٥) وابن أبي عاصم (١٤٢٨, ١٤٣١، ١٤٣٦ ) والحاكم (٤/ ٤٤٠) والنسائي في الفضائل (٨٧, ٩٠, ٩٢, ١٠٦) وأبو نعيم (١/ ٩٥) وغيرهم من حديث سعيد بن زيد مرفوعاً وإسناده صحيح وصححه الألباني الجامع الصغير (٤٠١٠).

وفي الباب عن عبدالرحمن بن عوف : أخرجه الترمذي (٣٧٤٨) وأحمد (١/ ١٩٣) وفي الفضائل (٢٧٨) والنسائي في الفضائل (٩١) والبغوي في شرح السنة (٣٩٢٥) بإسنادٍ صحيح .

جا تەڵحە : ناوی کوڕی عوبەیدوڵڵایە لەنەوەی تەمیمی کوڕی مورە یەکێکە لەو هەشتەی لە پێشەوە هاتوونەتە ناو ئیسلام و موسڵمان بووون، لەڕۆژی شەڕی جەمەلدا لەجەمادی کۆتای ساڵی ٣٦ی کۆچی کوژراوە لەتەمەنی ٦٤ساڵیدا.

وەزوبەیریش : ناوی ئیبن ولعەوامە لەنەوەی قوصەی کوڕی کیلابە پورزای پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وعلى آله وسلم لەڕۆژی شەڕی جەمەلدا وازی لەشەڕکردن هێنا لەسەر فەیلەقەکە ئیبن و جورموز هەبوو ئەوجا کوشتی لە جەمادی یەکەمی ساڵی ٣٦ی کۆچی لەتەمەنی ٦٧ساڵیدا .

وە عبدالرحمانی کوڕی عەوفیش : لەنەوەی زوهرەی کوڕی کیلابە لەساڵی ٣٢ی کۆچی لەتەمەنی ٧٢ساڵیدا مردووە و لە گۆڕستانی بەقیعدا نێژراوە .

وە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصیش : ناوی کوڕی مالیکە لەنەوەی عەبدمەنافی کوڕی زوهرە یەکەم کەسێکە لەپێناوی خوای گەورەدا تیری هاویشتبێت، لەناو کۆشکەکەی خۆیدا لە عەقیق لەدووری دەمیلی شاری مەدینەدایە وە لە گۆڕستانی بەقیعدا نێژراوە لەساڵی ٥٥ی کۆچی لەتەمەنی ٨٢ساڵیدا .

وەسەعیدی کوڕی زەیدیش : ناوی کوڕی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیلی عەدەوییە یەکێك بوو لەوانەی هەر زوو موسڵمان بوو ئەویش لە عەقیق مردووە و لە شاری مەدینەش نێژراوە لەساڵی ٥١ی کۆچیدا لەتەمەنی حەفتاو ئەوەندە ساڵیدا.

وەئەبوعوبەیدەش : ناوی عامری کوڕی عبدالله ی کوڕی جەڕاحە لەنەوەی فەهرە لەوانەیە کە زوو هاتوونەتە ناو ئاینی ئیسلامەوە لە ئوردون بە نەخۆشی تاعونی عەمواس مردووە لەساڵی ١٨ی کۆچی لەتەمەنی ٥٨ ساڵیدا.

وەلەوانەی کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم شاهێدی بەهەشتی بۆداون حەسەن و حوسەین و سابتی کوڕی قەیسە .

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم دەفەرمووێت :﴿ الحَسَنُ والحُسَيْنُ سَيِّدَا شَبَابِ أَهْلِ الجَنَّةِ ﴾ رواه الترمذی . وقال حسن صحيح [١]. واته﴿ حەسەن و حوسەین گەورەی گەنجەکانی ئەهلی بەهەشتن ﴾.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم دەربارەی سابتی کوڕی قەیس دەفەرمووێت :﴿ إِنَّكَ لَسْتَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ وَلَكِنَّكَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ ﴾[٢]

واته ﴿ بێگومان تۆ لە ئەهلی دۆزەخ نیت بەڵکو تۆ لەئەهلی بەهەشتیت ﴾ .

---

١ حديث صحيح : أخرجه الترمذي ( ٣٧٦٨) وأحمد ( ٣/ ١٦٦, ١٦٧) والنسائي في الكبرى كما في تحفة الأشرف (٣/ ٣٩٠) وابن حبان ( ٢٢٢٨–موارد ) والحاكم (٣/ ١٦٦, ١٦٧) والخطيب في تاريخ (٤/ ٢٠٧, ١١/ ٩٠) وأبو نعيم في الحلية (٥/ ٧١) من حديث أبي سعيد الخدري رضي الله عنه وقال الترمذي :حديث ﴿ حسن صحيح ﴾ .

وقال الألباني في الصحيحة (٧٦٩) ﴿ وهو كما قال ﴾ أ.هـ وأورد له طرق كثيرة عن جمع من الصحابة ثم قال ﴿وبالجملة فالحديث صحيح بلا ريب، بل متواتر كما نقله المناوي ﴾ أ.هـ .

٢ البخاري : كتاب المناقب : باب علامات النبوة ( ٣٦١٣) .

ومسلم : كتاب الإيمان : باب مخافة المؤمن أن يحبط عمله (١١٩) ( ١٨٧) من حديث أنس بن مالك.

فەرموودەکە موژدەیەکی زۆر خۆشی بۆهاوەڵە بەڕێزە تیادایە پێمخۆشە هەموو فەرموودەکە وەکو خۆی ببینی و بزانی باش نیە گومانی شەڕ ببیەیت چونکە ئەو هاوەڵە نازدارە وایدەزانی کەلەئەهلی دۆزەخە بەڵام پێغەمبەر صلی الله علیه وعلی اله وسلم موژدەی بەهەشتی پێدەدات :

حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ حَدَّثَنَا أَزْهَرُ بْنُ سَعْدٍ أَخْبَرَنَا ابْنُ عَوْنٍ قَالَ أَنْبَأَنِي مُوسَى بْنُ أَنَسٍ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ افْتَقَدَ ثَابِتَ بْنَ قَيْسٍ فَقَالَ رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَا أَعْلَمُ لَكَ عِلْمَهُ فَأَتَاهُ فَوَجَدَهُ جَالِسًا فِي بَيْتِهِ مُنَكِّسًا رَأْسَهُ فَقَالَ لَهُ مَا شَأْنُكَ فَقَالَ شَرٌّ كَانَ يَرْفَعُ صَوْتَهُ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ وَهُوَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَأَتَى الرَّجُلُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَخْبَرَهُ أَنَّهُ قَالَ كَذَا وَكَذَا فَقَالَ مُوسَى فَرَجَعَ إِلَيْهِ الْمَرَّةَ الْآخِرَةَ بِبِشَارَةٍ عَظِيمَةٍ فَقَالَ اذْهَبْ إِلَيْهِ فَقُلْ لَهُ إِنَّكَ لَسْتَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ وَلَكِنَّكَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ.

## ئەوانەی دیاریکراون لەئەهلی دۆزەخن لە قورئان و سوننەتدا

١- ئەوانەی دیاریکراون لە قورئاندا کە دۆزەخین ﴿ ئەبو لەهەب عەبدولعوزای کوڕی عەبدولموتەلّیب مامی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم و ژنەکەیەتی کەناوی دایکی جەمیل ئەروای کچی حەربی کچی ئومەیە خوشکی ئەبو سوفیانە ﴾ لەبەر فەرموودەکەی خوای گەورە : ﴿تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ۝١﴾ المسد: ١ واتە ﴿ یاخوا هەردوو دەستەکانی ئەبولەهەب بەبڕین بچن و تیابچن خۆ تیاش چوو ﴾. تاکۆتای سورەتەکە.

٢- وەلەوانەی دیاریکراون لە سوننەتدا کە دۆزەخین ﴿ ئەبو تالّیب عەبدمەنافی کوڕی کوڕی عەبدولموتەلّیبە ﴾ لەبەر فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم کەدەفەرمووێت : ﴿أَهْوَنُ أَهْلِ النَّارِ عَذَابًا أَبُو طَالِبٍ وَهُوَ مُنْتَعِلٌ بِنَعْلَيْنِ يَغْلِي مِنْهُمَا دِمَاغُه ﴾[١] واتە ﴿ سوکترین سزای ئەهلی دۆزەخ ئەبو تالّیبە کەئەویش دوو نەعلی لەپێدایە دەماغی بەهۆیانەوە دەکولّێت ﴾.

٣- وەلەوانە عەمری کوڕی عامری کوڕی لوحەی خوزاعیە لەبەر فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم کەدەفەرمووێت : ﴿رَأَيْتُهُ يَجُرُّ أَمْعَاءَهُ فِي

---

١ أخرجه بهذا اللفظ :

مسلم : كتاب الإيمان : باب أهون أهل النار عذابا (٢١٢) ( ٣٦٢) من حديث ابن عباس رضي الله عنه .

وأخرجه البخاري : (٦٥٦١) ومسلم (٢١٣)(٣٦٤) من حديث النعمان ابن بشير بلفظ :﴿ إِنَّ أَهْوَنَ أَهْلِ النَّارِ عَذَابًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَرَجُلٌ تُوضَعُ فِي أَخْمَصِ قَدَمَيْهِ جَمْرَتَانِ يَغْلِي مِنْهُمَا دِمَاغُهُ﴾.

النَّار ﴾ رواه البخاري وغيره[1]. واته ﴿ بينيم لـەناو ئـاگری دۆزەخـدا بـوو ڕیخۆڵـەكانی ڕادەكێشا ﴾.

⇦ ولاَ نُكفِّرُ أحدًا مِنْ أهلِ القِبلةِ بذَنْبٍ، ولاَ نُخرِجُهُ عَنِ الإسلامِ بِعَمَلٍ.

وەهیچ كەسێك لـەئەهلی قیبلـه بە بێ باوەڕ دانانیین بـەهۆی تاوانێكـەوە كـە ئـەنجامی داوە, وە لـەئاینی ئیسلامیش دەری ناكەین بەهۆی كارێكەوە كەكردوویەتی .

⇦ ونَرَى الحَجَّ والجِهَادَ ماضيًا مع طاعَةِ كلِّ إمامٍ بَرًّا كان أو فَـاجِرًا، وصـلاةُ الجمعةِ خلفَهم جائزةٌ.

وە ئێمـە باوەڕمـان وایـە كەحـەج و جیهـاد بەردەوامـە لـەگـەڵ گوێڕایـەڵی هـەموو پێشەوایەكدا ئیتر ئەو پێشەوایە چاك بێ یان خراپ بێت، وە نوێژی جومعـەش دروسـتە لەدوایانەوە ئەنجام بدرێت .

⇦ قال أنسٌ: قال النبيُّ – صلى الله عليه وسلم – «ثلاَثٌ مِنْ أصْـلِ الإيمَـانِ: الكَفّ عن مَنْ قَالَ لاَ إلَهَ إلاّ الله وَلاَ تُكَفّرْهُ بِذَنْبٍ وَلاَ تُخرِجْهُ مِنَ الإسْلاَمِ بِعَمَلٍ, وَالْجِهَادُ مَاضٍ مُنْذُ بَعَثَنِي الله عزّ وجلّ حتّى يُقَاتِلَ آخِرُ أُمّتِي الدّجّالَ لاَ يُبْطِلُه جَوْرُ جَائِرٍ وَلاَ عَـدْلُ عَادِلٍ, وَالإيمَانُ بالأَقْدَارِ» رواه أبو داود[2].

---

١ البخاري : كتاب التفسير كم سـورة المائـدة : بـاب ﴿مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٍ وَلَا سَآئِبَةٍ وَلَا وَصِيلَةٍ وَلَا حَامٍ وَلَٰكِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَأَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٠٣﴾﴾ المائـدة: ١٠٣﴾ (٤٦٢٤) مـن حـديث عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأَيْتُ جَهَنَّمَ يَحْطِمُ بَعْضُهَا بَعْضًا وَرَأَيْتُ عَمْرًا يَجُرُّ قُصْبَهُ وَهْوَ أَوَّلُ مَنْ سَيَّبَ السَّوَائِبَ ﴾.

وفي الباب عن جابر في حديث الكسوف الطويل وفيه ﴿وَرَأَيْتُ أَبَا ثُمَامَةَ عَمْرَو بْنَ مَالِكٍ يَجُرُّ قُصْبَهُ فِي النَّارِ﴾ أخرجه مسلم (٩٠٤)(٩) . قُصْبَهُ : ڕیخۆڵەی.

٢ حديث ضعيف : أخرجه أبوداود (٢٥٣٢) وأبـو عبيـد القاسـم بـن سـلام في الإيمـان ص (٤٧) وإسـناده ضعيف فيه يزيد بن أبي شيبة وهو مجهول كما في التقريب وضعف إسناده المنذري في مختـصر سـنن أبـي داود (٣/ ٣٨٠) لهذا السبب .

ئەنەس فەرمووی : پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرمووێت :

﴿سێ شت هەیە لەبنچینەی باوەڕە : دەست هەڵگرتن لەسەر کەسێك بڵێـت لاَ إلَـهَ إلاّ الله، وە بـەبێ بـاوەڕی دانـەنێیت بـەهۆی تاوانێکـەوە ئـەنجامی دەدات وە لـەئاینی ئیسلامیش دەری نەکەیت بـەهۆی کارێکـەوە دەیکـات، وەجیهـادیش بەردەوامـە لـەو کاتەوەی خوای گەورە منی ناردووە تا کۆتای ئوممەتەکەم لەگـەڵ دەجالـدا شـەڕدەکەن ستەمی هیچ ستەمکارێك پوچی ناکاتەوە وە دادگەری هیچ دادگەرێکیش بەهەمان شـێوە بەتاڵی ناکاتەوە، وەباوەڕ هێنان بە قەدەرەکان ﴾.﴿ فەرموودەیەکی لاوازە ئاگاداربە ﴾.

## ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

## ﴿ بێباوەڕکردنی ئەهلی قیبلە بەهۆی ئەنجامدانی تاوانەوە ﴾

ئەهلی قیبلـە ئەوانەن موسڵمانن و ڕووی تێدەکەن لـەکاتی نوێژکردنـدا بێباوەڕناکرێن بەهۆی ئەنجامدانی تاوانەوە وەلـە ئاینی ئیسلامیش دەرناکرێن بەهۆی ئەوەوە وە لـەئاگری دۆزەخیشدا نامێننـەوە لـەبـەر فەرموودەکـەی خـوای گـەورە کەدەفـەرمووێت :﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ﴾ الحجرات: ٩ واتـە ﴿ وەئەگـەر دووکۆمـەڵ لەباوەڕداران بوو شەڕیان ئەوا ئێوە ئاشتیان بکەنەوە ﴾.

تا ئەو شوێنەی کە دەفـەرموێت :﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٠﴾ ﴾ الحجرات: ١٠ واتە ﴿ باوەڕداران هەموو برای یەکن جاکەوایە چاکسازی و ئاشتەوای بخەنە نێوان براکانتانەوە، وەپارێزکـاری خـوای گـەورە بکـەن و لێی بترسن سابەڵکو ڕەحمتان پێ بکرێت ﴾.

جاخوای گەورە برایەتی باوەڕی جێگیرکرد لەگـەڵ شـەڕکردن و کوشتاریـشدا کـە شەڕکردن و کوشتارکردن لـە تاوانـە گەورەکانـە وەئەگـەر بێـاوەڕی بووایـە برایـەتی باوەڕی نەدەهێشت .

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم دەفەرموویت خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةِ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ فَأَخْرِجْهُ ﴾ واتە لەئاگر . بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە [1].واتە ﴿ هەرکەسێك لەدڵیدا بەئەندازەی تۆوە خەرتەلەیەك باوەڕ هەبێت ئەوا دەری بهێنن ﴾.

وە دوو کۆمەڵ پێچەوانەی ئەوەن:

یەکەمیان : خەواریجەکانن دەڵێن : بکەری ﴿ ئەنجامدەری ﴾ گوناهی گەورە بێباوەڕەو بەهەتاهەتایی لەئاگری دۆزەخدا دەمێنێتەوە .

دووەمیان : موعتەویلەکانن دەڵێن : بکەری ﴿ ئەنجامدەری ﴾ گوناهی گەورە لەبازنەی باوەڕ چووەتە دەرەوە بەڵام نەباوەڕدارە نە بێباوەڕیشە لە شوێنیکدایە لەنێوان ئەو دووشوێنەدا وەئەو کەسەی ئەنجامدەری گوناهی گەورەیە بەهەتا هەتایی لەئاگری دۆزەخدا دەمێنێتەوە .

ئێمەش بەرپەچی هەردوو کۆمەڵەکە دەدەینەوە بەوەی :

١- پێچەوانەکردنیان بۆ دەقەکانی قورئان و سوننەت .

٢- پێچەوانەکردنیان بۆ یەکدەنگی پێشین .

---

[1] البخاري : كتاب الإيمان : باب زيادة الإيمان ونقصانه ﴿ ٤٤ ﴾.
ومسلم : كتاب الإيمان : باب أني أهل الجنة منزلة ﴿ ١٩٣ ﴾ ﴿ ٣٢٥ ﴾ من حديث أنس بن مالك رضي الله عنه.

ومِنَ السُّنَّةِ تَوَلِّي أصحابَ رسولِ اللهِ – صلى الله عليه وسلم – ومحبَّـتُهُم، وذِكْرُ محاسنِهم، والتَّرَحُّمُ عليهم، والاستغفارُ لهم، والكَفُّ عن ذِكْرِ مسَاوئِهم، ومَا شَـجَرَ بَيْنَهُم، واعتِقادُ فَضْلِهِم، ومعرِفةُ سابِقَتِهم.

وەلەسوننەتی پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وعلى آلـه وسـلم دۆسـتایەتی كردنـی هاوەڵـەكانی پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليـه وعلـى آلـه وسـلم وە خـۆش ویـستنیان وەباسـكردنی چـاكەكانیان، وەبـەزەیی پێداهاتنـەوەیان، وەداوای لێخۆشـبوون بۆیـان، وەدەسـتهەڵگرتن لەباسـكردنی خراپـەكانیان وەلـەوەی ڕوویـداوە لەنێوانیانـدا وەبیرواوەڕبوون بەوەی گەورەیی و چاكەیان هەیە وەشارەزابوون لەپێشینەیەتیان .

خـوای گـەورە دەفـەرمووێت ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ الحشر: ١٠

واتە ﴿ ئەوانەش لەدوای ئەوانەوە هاتوون واتە لەپاش كۆچكەران و یارمەتیدەرانـەوە هاتوون دەڵێن : ئەی پەروەردگارمان لەئێمەو لەو برایانەمان پێش ئێمە باوەڕیـان هێنـاوە خۆش ببە وەهیچ بوغزێك مەخە دڵمانەوە بەرامبەر بەو كەسانەی باوەڕیان هێناوە ﴾.

وەهــەروەها دەفــەرموێت﴿ مُّحَمَّدٞ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ ﴾ الفـتح: ٢٩ واتە ﴿ محمد صلى الله عليه وعلى آله وسلم پێغەمبەرو نێردراوی خوایە پێیان خـۆش بێت یان نا ئەو كەسانەش لەگەڵ ئەون و شوێنی ئـەو كـەوتوون لەبەرامبـەر بێبڕواكانـدا ئازاو بەهێزن لەناو خۆیشیاندا میهرەبان و بەسۆز و دڵنەرمن ﴾.




## ﴿مافەکانی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم﴾

هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم چاکەیەکی گەورەیان بەسەر ئەم ئوممەتەوە هەیە بەجۆرێك کە هەستان بەسەرخستنی خواو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم وە تێکۆشان لەپێناوی خوادا بەماڵ و گیانیان وە هەستاون بە پاراستنی ئاینی ئیسلام ئەویش بەپاراستنی قورئانەکەیی و سوننەتی پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وعلی آله وسلم بە زانست و کردارو فێرکردن تا گەیاندیانە ئوممەت بەشێوەیەکی زۆر خاوێن و جوانی .

وەبێگومان خوای گەورە بەباشی باسیکردوون لەپەرتووکەکەیدا بەگەورەترین باسکردن بەجۆرێ لەسورەتی فەتحدا دەفەرمووێت : ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗا﴾ الفتح: ٢٩

واتە ﴿ محمد صلی الله علیه وعلی آله وسلم پێغەمبەرو نێردراوی خوایە پێیان خۆش بێت یان نا ئەو کەسانەش لەگەڵ ئەون و شوێنی ئەو کەوتوون لەبەرامبەر بێبڕواکاندا ئازاو بەهێزن لەناو خۆیشیاندا میهرەبان و بەسۆز و دڵنەرمن، دەیانبینیت هەردەم خەریکی ڕکوع و سوژدەن واتە زۆر خەریکی خوا پەرستی و نوێژن بەشەودا شەو نوێژدەکەن و بەڕۆژیشدا سوارچاکی مەیدانن، هەموو کات ئاواتیان بەدەست هێنانی فەزڵ و بەهرەو میهرەبانی خوایە، مەبەستیان ئەوەیە خوا لێیا ڕازی بێت ﴾.

وەپاراستنی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم پاراستنی ڕێزی هاوەڵەکانیەتی بەجۆرێك کەدەفەرموویت ﴿لاَ تَسُبُّوا أَصْحَابِي فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا أَدْرَكَ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَلاَ نَصِيفَهُ﴾ متفق عليه [1].

واته ﴿ جنێو بەهاوەڵەکانم مەدەن جاسوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە چونکە ئەگەر هەریەکێك لەئێوە بەئەدازەی کێوی ئوحد ئالتوون ببەخشێت ئەوە ناگات بەتەنها بەگوێلێکی کەسێك لەواندا یان نیو گوێلی ﴾.

جا مافیان لەسەر ئوممەت لەگەورەترین مافەکانە، ئەوەی لەسەر ئوممەتە لەبەرامبەریاندا بۆیان جێ بەجێی بکەن :

١- خۆشویستنیان بەدڵ و وەبەباش باسکردنیان بە زوبان بەوەی شایستەیانە لەباشیو چاکە.

٢- بەزەیی هاتنەوە پێیاندا و داواکردنی لێخۆشبوون بۆیان وەك جێ بەجێ کردنێك بۆ فەرموودەکەی خوای گەورە دەفەرموویت :﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ ﴿١٠﴾﴾ الحشر: ١٠

واته ﴿ ئەوانەش لەدوای ئەوانەوە هاتوون واتە لەپاش کۆچکەران و یارمەتیدەرانەوە هاتوون دەڵێن : ئەی پەروەردگارمان لەئێمەو لەو برایانەمان پێش ئێمە باوەڕیان هێناوە

---

[1] البخاري : كتاب فضائل الصحابة : باب قول النبي صلى الله عليه وعلى آله وسلم :﴿ لو كنت متخذا خليلا ..﴾ (٣٦٧٣) .

ومسلم : كتاب فضائل الصحابة : باب تحريم سب الصحابة ( ٢٥٤١) ( ٢٢٢) من حديث أبي سعيد الخدري رضي الله عنه .

خۆش ببە وەهیچ بوغزێك مەخە دڵمانەوە بەرامبەر بەو كەسانەی باوەڕیان هێناوە ئەی پەروەردگاری ئێمە بەڕاستی تەنها ئەتۆی بەسۆزی میهرەبان ﴾.

٣- وەدەستهەڵگرتن لەباسكردنی خراپەكانیان وەلەوەی ڕوویداوە لەنێوانیاندا كەئەگەر لەیەكێكیانەوە ڕوویدابێت ئەوە زۆر كەمە بەبەراورد لەگەڵ ئەوەی هەیان لەچاكەو گەورەیی وەلەوانشە لەئەنجامی تێكۆشانێكی لێخۆشبووە وە كارێكی پۆزش بۆهێنراوە ڕوویدابێت لەبەر فەرموودەكەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم كەدەفەرمووێت ﴿لاَ تَسُبُّوا أَصْحَابِي فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا أَدْرَكَ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَلاَ نَصِيفَهُ﴾ متفق عليه.

واتە ﴿ جنێو بەهاوەڵەكانم مەدەن جاسوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە چونكە ئەگەر هەریەكێك لەئێوە بەئەندازەی كێوی ئوحد ئالتوون ببەخشێت ئەوە ناگات بەتەنها گوێلێكی كەسێك لەواندا یان نیو گوێلی ﴾.

وقال النبيُّ صلى الله عليه وسلم «لا تَسبّوا أصحابي, فلو أنّ أحدَكم أنفقَ مثلَ أُحُدٍ ذهَباً ما بَلغَ مُدّ أحدِهم ولا نَصيفَه»[١].

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم کەدەفەرموویت ﴿ جنێو بەهاوەڵەکانم مەدەن چونکە ئەگەر هەریەکێك لەئێوە بەئەندازەی کێوی ئوحد ئاڵتوون ببەخشێت ئەوە ناگات بەتەنها گوێلی یەکێکیان یان نیو گوێلی ﴾.

**ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین**

## ﴿ حوکمی جنێودان بە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم ﴾

جنێودان بە بە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دابەش دەبێت بەسەر سێ بەشدا :

یەکەم : کە جێودان پێیان بەوەی بێباوەڕبوونی زۆربەیان بخوازێت یان کە هەرهەموویان لەسنوردەرچوون واتە فاسقن جائەوە بێباوەڕییە لەبەرئەوەی بەدرۆخستنەوەیە بۆ خواو پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم بەوەی ئەوان بەباشە باسیان کردوون و ڕازیبوون لێیان بەڵکو هەرکەسێك دوودڵ بێت لەبێباوەڕی وەك ئەوەدا ئەوا بێباوەڕیەکەی دیاروئاشکرایە چونکە ناواخنی ئەو قسەیە ئەوەیە کە گوێزەرەوانی قورئان یان سوننەت بێباوەڕن یان لەسنور دەرچوون.

---

[١] البخاري : كتاب فضائل الصحابة : باب قول النبي صلى الله عليه وعلى آله وسلم :﴿ لو كنت متخذا خليلا ..﴾ (٣٦٧٣) .

ومسلم : كتاب فضائل الصحابة : باب تحريم سب الصحابة ( ٢٥٤١) ( ٢٢٢) من حديث أبي سعيد الخدري رضي الله عنه .

دووەم : کە جنێویـان پێبـدات بەنـەفرەتکردنیان و بەناشـیرین باسـکردنیان ئـەوا لـە بێباوەڕکردنیدا زانایان دوو قسەیان هەیە وەلەسەر ئەو قسەیەی کە دەڵێت پێی بێبـاوەڕ نابێت پێویستە شەلاقی لێبدرێت و بەندبکرێت تادەمرێـت یـان دەگەڕێتـەوە و پەشـیمان دەبێتەوە لەوەی ووتویەتی .

سێیەم : کەجێویان پێبدات بەوەی دینەکەیانی پیٚ ناشیرین نەبێت وەکو ﴿ ترسـنۆك و چرووکی ﴾ ئەوا بێباوەڕ نابێت بەوە بەڵام تـەمبیٚ دەکرێـت بـەوەی بیگێڕێتـەوە لـەوە، شەیخی ئیسلام ئیبن و تەیمیە واتای ئەوەی باسکردووە لەکتابی ﴿ الـصارم المـسلول﴾ وە لە پێشەوا ئەحمەدەوە هێناویەتی لەلاپەڕە ٥٧٣ وتەکەی :﴿ دروست نیە بۆ هیچ کەسێك کەباسی هیچ شتێك بکات لە خراپەکانیان وە تانەش نەدات لە هیچ کەسێکیان بـەبوونی عەیبێك یان کەمو کورتیەك تێیاندا جاهەرکەسێك شتێکی وایکرد ئەوا ئەدەبی دادەدرێت جائەگەر گەڕایەوە ئەوە باشە وەئەگەرنا ئـەوا شـەلاقی لێـدەدرێت لــە بەندینخانـەدا تـا دەمرێت یان دەگەڕێتەوە لەو قسەیەو تەوبە دەکات ﴾.

وَمِنَ السُّنَّةِ التَّرَضِّي عَنْ أَزْوَاجِ رسولِ اللهِ – صلى الله عليه وسلم –، أُمَّهاتِ المؤمنينَ المُطهَّراتِ، المُبَرَّآتِ مِنْ كلِّ سوءٍ، أفضلُهنّ خديجةُ بنتُ خُوَيْلِدٍ وعائشةُ الصّديقةُ بنتُ الصّديقِ التي بَرّأَهَا اللهُ فِي كتابِهِ، زَوْجُ النبيِّ – صلى الله عليه وسلم – في الدنيا والآخرةِ، فمَنْ قَذَفَهَا بما بَرَّأها اللهُ مِنْهُ فَقَدْ كَفَرَ باللهِ العظيم .

وەلەسوننەتی پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وعلى آله وسلم ڕازیبوون لە خێزانەکانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دایکانی باوەڕداران خاوێنەکان ئەوانەی دوورن لەهەموو خراپەیەك، باشترینیان دایکمان خەدیجەی کچی خووەیلیدە، وەعائیشەی ڕاستگۆی کچی ڕاستگۆیە کە خوای گەورە بەدووری گرتووە لە پەرتووکەکەیدا، ژنی پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وعلى آله وسلم لە دونیاو دوارۆژدا، جاهەرکەسێك تۆمەتباری بکات بەوەی خوای بەدووری گرتووە لێی ئەوا بێگومان بێباوەڕە بەخوای گەورە.

## ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

### ﴿ مافەکانی خێزانەکانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم ﴾

ژنەکانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم خێزانین لە دونیاو دوا ڕۆژدا وەدایکی باوەڕدارانن وەبۆ ئەوان هەیە ڕێز و بەگەورەدانان لەوەی کەشایستەی ئەوان بێت وەکو خێزانی کۆتایی پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت، جائەوانە لە بنەماڵەی پێغەمبەری خوان صلى الله عليه وعلى آله وسلم ﴿ واتە لەئال و بەیتی ئەون ﴾ خاوێن و خاوێنکراوەن، باش و باشکراون، دوورن و بەدوورگیراون لە هەموو خراپەیەك کەببێتە هۆی ناشیرین کردنی ناموسیان و ژیانی ژن و مێردایەتیان، جائەوانەی پاکن لەژنان بۆ پاکەکانن لە پیاوان، وەئەوانەی پاکن لە پیاوان بۆ پاکەکانن لی ژنان، جاخوای گەورە

لێیان ڕازی بووە و هەموویانی ڕازیکردوە وەدروودو سلاوی خوا لەسەر پێغەمبەرە ڕاستگۆ و دەستپاکەکەی بێت صلى الله عليه وعلى آله وسلم .

**﴿ ئەو ژنانەی کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم مردوو بەجێی هێشتن و ئەوانە ژنی بوون بریتین لە :**

١- خەدیجەی کچی خووەیلید دایکی مندالّەکانی جگە لە ئیبراهیم، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم مارەیکرد لە دوای دوو شو یەکەمیان عەتیقی کوڕی عابید وەدووەم ئەبو هالەی تەمیمی، وە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم ژنی بەسەردا نەهێنا تا لەسالّی ١٠ی کۆچی لە پێغەمبەرایەتیدا لەپێش میعراجدا .

٢- عائیشەی کچی ئەبوبەکری صدیق لەخەودا پیشانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم درا [١] دووجار یان سێ جار : وەووترا :﴿ ئەمە ژنی تۆیە ﴾ لەتەمەنی شەش سالّیدا لەشاری مەککە مارەی کرد و لەتەمەنی نۆ سالّیدا لەشاری مەدینە گواستیەوە، وەلەسالّی ٥٨ی کۆچی مرد .

٣- سەودەی کچی زەمعەی ئەلعامرییە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم لەدوای مێردێکی موسلّمان مارەی کرد کەئەویش سەکرانی کوڕی عەمری برای سوهەیلی کوڕی عەمرە، دایکمان سەودە ڕەزای خوای لێ بێت لەکۆتای جێنشینیەتی عومەری خەتتابدا ڕەزای خوای لێ بێت مردووە وە ووتراویشە لەسالّی ٥٤ی کۆچیدا مردووە .

---

[١] البخاري : كتاب مناقب الأنصار : باب تزويج النبي صلى الله عليه وعلى آله وسلم ..... عائشة (٣٨٩٥).

ومسلم : كتاب فضائل الصحابة : باب فضل عائشة ... (٢٤٣٨) (٧٩) من حديث عائشة رضي الله عنها.

٤- حەفصەی كچی عومەری كوڕی خەتتاب ڕەزای خوای لیّ بیّت پیّغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم لەدوای میّردیّكی موسڵمان مارەی كرد كەئەویش خونەیسی كوڕی حوزافەی سەهمیە كەلەڕۆژی شەڕی ئوحددا شەهیدكرا، وە دایكمان حەفصە ڕەزای خوای لیّ بیّت لەساڵی ٤١ی كۆچیدا مردووە .

٥- زەینەبی كچی خوزەیمەی هیلالیە دایكی هەژاران : پیّغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم لەدوای شەهیدكردنی میّردەكەی لەشەڕی ئوحددا كەناوی عبدالله ی كوڕی جەحش بوو مارەی كرد، وەدایكمان زەینەب لەساڵی ٤ی كۆچی لەدوای ئەوەی ماوەیەكی كەم ژنی پیّغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم بوو مرد .

٦- ئوم و سەلەمە هیندی كچی ئەبی ئومەی یەی مەخزومی پیّغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم لەدوای مردنی میّردەكەی كەئەویش ئەبی سەلەمە عبدالله ی كوڕی عەبدلئەسەد بوو لەدوای ئەوەی لەشەڕی ئوحددا بریندار كرا مرد مارەی كرد,

وەدایكمان ئوم و سەلەمە لەساڵی ٦١ی كۆچیدا مردووە .

٧- زەینەبی كچی جەحشی ئەسەدییە كچی پوری پیّغەمبەری خوایە صلی الله علیه وعلی آله وسلم لەدوای ئەوەی زەیدی كوڕی حاریس تەڵاقیدا پیّغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم لەساڵی ٥ی كۆچیدا مارەی كرد، دایكمان زەینەب لەساڵی ٢٠ی كۆچیدا مردووە .

٨- جوەیرییەی كچی حارسی خوزاعییە پیّغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم لەدوای میّردەكەی كەناوی موسافیعی كوڕی صەفوان بوو وە ووتراویشە مالیكی كوڕی صەفوان بوو مارەی كرد لەساڵی ٦ی كۆچیدا، وەدایكمان جوەیرییە لەساڵی ٥٦ی كۆچیدا مردووە .

٩- ئوم و حەبیبە ڕەملەی ئەبی سوفیان پێغەمبەری خـوا صـلی الله علیـه وعلـی آلـه وسلم لەدوای مێردەکەی کەناوی عوبەیدوڵڵای کوڕی جەحش بوو مارەی کـرد ئـەم پیاوە سەرەتا موسڵمان بوو پاشان بـوو بـە گـاور، وەدایکمـا لەسـاڵی ٤٤ی کۆچـیدا لەشاری مەدینە لەسەردەمی خیلافەتی براکەیدا مردووە .

١٠- صەفییەی کچی حویەیی کوڕی ئەختەب لەنەوەی نـەزیر لـەکوڕانی هـاروونی کوڕانی عیمران، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلـی آلـه وسـلم ئـەم ئافرەتـەی ئـازاد کردو ئازادکردنەکەی کردە مارەیی بۆی و بوو بەخێزانی لەدوای ئـازادکردنی خەیبـەر لەساڵی ٦ی کۆچـی، لـە دوای دوو مێـرد بـەناوەکانی ﴿ سـەلامی کـوڕی میـشکەم، وەدووەم کینانەی کوڕی ئەبیل حەقیق ﴾, وەدایکمـان ڕەزای خـوای لێ بێـت لەسـاڵی ٥٠ی کۆچیدا مردووە.

١١- مەیمونەی کچی حارسی هیلالیە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم لەساڵی ٧ی کۆچیدا مـارەیکرد لـەکاتی گێرانـەوەی عومرەکـەدا لـەدوای دوو مێـرد یەکەمیان کوڕی عەبد یالیل وە دووەم باوکی ڕەهمی کـوڕی عبـدول عـوزا، وەدایکمـا لەساڵی ٥١ی کۆچیدا مردووە .

جائەمانە ژنەکانی پێغەمبەری خوان صلی الله علیه وعلی آله وسلم کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلی آله وسلم مردوو جێیی هێـشتن دووان لەوانـە پـێش خـۆی مـردن کەئەوانیش ﴿ خەدیجەو زەینەبی کچی خوزەیمەیە ﴾ وەنۆشیان کاتێك کە مـرد لەژیانـدا بوون .

وە دەمێنێتەوە دووان کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وعلـی آلـه وسـلم نـەیکردن بەژنی خـۆی وەبـۆهیچ کـام لەوانـە ئـەو ئـەحکام و گەورەیەتیانـەی ئەوانـەی پێـشوو دەیگرتنەوە ئەمان ناگرێتەوە : کەئەوانیش :

١- ئەسمائی کچی نوعمانی کیندییە پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وعلى آلە وسلم مارەیکرد پاشان لێی جیابووە وە وە جیاوازی هەیە لەنێوان زانایاندا لە هۆکاری جیابوونەوەکەدا، ئیبن و ئیسحاق فەرموویەتی سپیایەکی لە قەبرغەیدا بینی جا لێی جیابووە وە پاش ئەوە موهاجری کوڕی ئەبی ئومەیە مارەیکرد.

٢- ئومەیمەی کچی نوعمانی کوڕی شەراحبیلی جونیە وەهەر ئەویشە کە ووتویەتی ﴿پەنائەگرم بە خوا لەتۆ﴾ جا پێغەمبەری خوا صلى الله علیە وعلى آلە وسلم وازی لێهێنا . والله أعلم.

وەباشترینی ژنەکانی پێغەمبەری خوا صلى الله علیە وعلى آلە وسلم خەدیجەیە وە عائیشەیە ڕەزای خوایان لێ بێت وە بۆهەریەکێك لەوانە بایەخی خۆیان هەیە بەسەر ئەوی تریانەوە [1] جابۆ خەدیجە هەیە لەسەرەتای ئیسلامدا کەبۆ عائیشە نیە لە زوو موسڵمان بووندا و پشتگیری و سەرخستندا، وەبۆ عائیشە هەیە لەکۆتایی ئیسلامدا کە بۆ خەدیجە نیە لە بڵاوکردنەوەی زانست و سوود گەیاندن بە ئوممەت وە بێگومان خوای گەورە بەدووری گرتووە لەوەی دووڕووەکان دایانە پاڵی لەو درۆیەی بۆیان هەڵبەست لەسورەتی نوردا .

---

١ قال الحافظ الذهبي في سير أعلام النبلاء (٢/ ١٤٠) في ترجمة أم المؤمنين عائشة : ﴿ وكانت إمرأة بيضاء جميلة ومن ثم يقال لها الحميراء . ولم يتزوج النبي صلى الله عليه وعلى آله وسلم بكراً غيرها، ولا أحب إمرأة حبها . ولا أعلم في أمة محمد صلى الله عليه وعلى آله وسلم بل ولا في النساء مطلقاً إمرأة أعلم منها وذهب بعض العلماء غلى أنها أفضل من أبيها وهذا مردود وقد جعل الله لكل شيء قدرا، بل نشهد أنها زوج نبينا صلى الله عليه وعلى آله وسلم في الدنيا والآخرة فهل فوق ذلك مفخر، وإن كان للصديق خديجة شأوٌ لايلحق وأنا واقف في أيتهما أفضل . نعم جزمت بأفضلية خديجة عليها لأمور ليس هذا موضعها ﴾أ.هـ .

## ﴿ تۆمەت هەڵبەستن بۆ دایکانی باوەڕداران ﴾

تۆمـەتبارکردنی دایکمـان عائیـشە بـەوەی خـوای گـەورە بـەدووری گرتـووە لێـی بێباوەڕییە لەبەرئـەوەی بەدرۆخـستنەوەی قورئانـە، وەلـە تۆمـەتبارکردنی جگـە لـەودا لەدایکانی باوەڕداران زانایان دوو قسەیان لەو بارەوە هەیە ڕاستڕینیا ئەوەیە کە ئەو کارە بێباوەڕییە لەبەرئەوەی لەکەدارکردن و ناشیرینکردنی پێغەمبەری خوایـە صـلی الله علیـە وعلی آلە وسلم چونکە ژنی پیس بۆ پیاوی پیس دەبێت . ﴿ ئەگەر ئـەوان پـیس بـووبن ئەوا ئەو قسەیە ئەوە دەگەیەنێ پەنا بەخوای گەورە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وعلـی آلە وسلم پیس بووبێت کەئەوەش بێباوەڕییە چونکە هـەرگیز پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیە وعلی آلە وسلم بـەوە ڕازینابێـت خێزانـەکانی بـەجۆرێك بـن دەی کەئـەوەمان لێ نـەبینیوە کەواتـە هـەموو خێزانـەکانی چـاك و ڕێکـو پێـك بـوون و هەرکەسـێکیش هەرقسەیەکیان بۆ هەڵبەستێت لەبایەخیان کەم بکاتەوە و ناموسیا لەکـەدار بکـات ئـەوە بێباوە هەروەکو زانایان دەفەرموون – وەرگێڕ ﴾.

ومعاويةُ خالُ المؤمنينَ، وكاتِبُ وحْيِ اللهِ، أحدُ خلفاءِ المسلمينَ رضـي الله عنهم .

وەباوەڕمان وایە موعاویە خاڵی باوەڕدارانـە، وە نووسـەری وەحـی خـوای گـەورە، یەکێکە لە جێنشینەکانی موسڵمانان ڕەزای خوای گەورە لە هەموویان بێت .

## ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

## ﴿ موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ڕەزای خوایان لێ بێت ﴾

فەرمانڕەوای باوەڕداران عوماویە کوڕی ئەبو سوفیان صەخری کوڕی حەرب لە پێش پێغەمبەرایەتیدا بە ٥سالْ لەدایك بووە وە لە سالّی ڕزگارکردنی مەککەدا موسڵمان بووە، وەووتراوە لەدوای حودەیبیە موسڵمان بووە و ئیسلامەتیەکەی شاردۆتەوە، پێشەوا عومەر کردی بە والی شام وەبەردەوامیش بوو لەسەری وەدەناسرێت بە جێنشینایەتی لەدوای دوو ماوەی دەستەڵات سالّی ٣٧ی کۆچی وەخەڵکی لەدەوری کۆبوونەوە لەدوای وازهێنانەکەی حەسەنی کوڕی عەلی ڕەزای خوایان لێ بێت لەسالّی ٤١ی کۆچیدا، پێشەوا موعاویە وەحی بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەنووسیەوە وەیەکێك بوو لەوانەی نووسەری وەحی بوون، وەلەمانگی ڕەجەبی سالّی ٦٠ ی کۆچیدا لەتەمەنی ٧٨ سالّیدا مردووە، دانەر لەبەرئەوە ناوی هێناوە و بەباشە باسی کردووە بۆ ڕەد دانەوەی ڕافیزیەکان ئەوانەی جنێوی پێدەدەن وەزۆر بەخراپە باسی دەکەن، وەبەخالّی باوەڕداران ناوی هێناوە چونکە برای دایکمان ئوم و حەبیبەیە ڕەزای خوای لێ بێت یەکێکە لەدایکەکانی باوەڕداران، وەبێگومان شەیخی ئیسلام ئیبن و تەیمیە لەپەرتووکە بەنرخەکەیدا ﴿ منهاج السنة النبوية بەرگی ٢ لاپەڕە ١٩٩ ﴾ باسی ناکۆکی نێوان زانایانی کردووە سەبارەت بەوەی ئایە بەبرای دایکانی باوەڕداران دەگوترێت خالۆکانی باوەڕداران یان نا؟ ﴾.

ومِنَ السُّنَّةِ السَّمْعُ والطاعَةُ لأئمةِ المسلمينَ وأُمَرَاءِ المؤمنينَ بَرِّهِمْ وفَاجِرِهِمْ، ما لم يأمروا بمعصيةِ اللهِ، فإنَّه لا طاعةَ لأحدٍ في معصيةِ اللهِ.

وەلەسوننەتی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیە وعلی آلە وسلم گوێڕایەڵیکردنی پێشەواکانی موسڵمانان وە فەرمانڕەواکانی باوەڕداران، چاکیان و خراپیان، تائەو کاتەی فەرمان نەکەن بەسەرپێچی کردنی خوای گەورە، چونکە گوێڕایەڵی هیچ کەسێك ناکرێت لەسەرپێچی کردنی خوای گەورەدا .

ومَنْ وَلِيَ الخلافةَ، واجتمعَ عليه النّاسُ ورَضُوا بِهِ، أوْ غلبَهُم بسيْفِهِ حتَى صَارَ الخليفة، وسُمِّيَ أميرَ المؤمنينَ، وجبَتْ طاعتُهُ، وحَرُمَتْ مُخَالفَتُهُ والخُروجُ عَلَيهِ وشَقُّ عصَا المسلمينَ.

وەهەرکەسێك دەستەڵاتی گرتە دەست، وەخەڵکیش کۆبون لەسەری و ڕازیبوون پێی یان زاڵبوو بەشمشێرەکەی بەسەریاندا تا بوو بە خەلیفە، وەناسرا بە فەرمانڕەوای باوەڕداران، پێویستە گوێڕایەڵیکردنی، وەحەرامە سەرپێچیکردنی وە دەرچوون لەسەری وەلەتکردنی هێزو دەستەڵاتی موسڵمانان .

ڕاڤەی شێخ ئیبنو عثیمین

خەلافەت پلەو پایەیەکی گەورەیە وە بەرپرسیاریەتیەکی مەزنە کەئەویش گرتنە دەستی هەڵسوڕاندنی کاروباری موسڵمانانە بەجۆرێك کەئەو دەبێتە بەرپرسیاری یەکەم لەوەد,

وەئەوەش فەرزی کیفایەیە لەبەرئەوەی کاروباری موسڵمانان بەو دەستەڵاتە نەبێت بەڕێوە ناچێت، وەخەلافەت بەیەکێ لەم سێ شێوەیە دێتەجێ :

یەکەم : بوونی دەقێك لەسەردانانی لەلایەن خەلیفەی پێشووە وە هەروەکو لە خەلافەتی عومەری کوڕی خەتابدا ڕوویدا چونکە ئەوە بە دەقێك بوو لەلایەن پێشەوا ئەبوبەکری صدیقەوە ڕەزای خوای لێ بێت .

دووەم : کۆبوونەوەی ﴿ أهل الحل والعقد – ئەو کەسانەی کاروبارەکان هەڵدەسەنگێنن و شیدەکەنەوە و دوای ئەوە بڕیاری لەبارەوە دەردەن کە پێشی

دەگوترێت ڕاوێژ ﴾ بۆدانانی كەسێك لەناو كۆمەڵە كەسێكدا ئیتر ئەو كەسانە دیاریكراو بن لەلایەن خەلیفەی پێشووە وە هەروەكو لەخەلافەتی پێشەوا عوسماندا ڕەزای خوای لێ بێت ڕوویدا جادانانی ئەو كەسە بەكۆبوونەوە بوو لەلایەن شوراوە كەدیاریكران لەلایەن پێشەوا عومەرەوە ڕەزای خوای لێ بێت یان دیاریكراو نەبوون هەروەكو ئەوەی خەلیفە ئەبوبەكر ڕەزای خوای لێ بێت لەسەر یەكێك لە وتەكان وەهەروەكو لە خەلافەتی عەلیدا ڕوویدا ڕەزای خوای لێ بێت .

سێیەم : یان بەشێوەی زۆر و دەستبەسەرداگرتن بێت هەروەكو لە خەلافەتی عەبدولمەلیكی كوڕی مەڕواندا ڕوویدا لەكاتێكدا عبدالله ی كوڕی زوبەیر كوژراو دەستەڵات بوو بەموڵكی ئەو .

**ڕونكردنەوەی وەرگێڕ** : دانانی خەلیفە لەهەمووشوێنێكدا بەو سێ شێوەیە دەبێت:

١- دانانی كەسێكی متمانە پێكراو لەلایەن دەستەڵاتداری پێشووە وە پێش مردنی هەروەكو پێشەوا ئەبوبەركر ڕەزای خوای لێ بێت پێش ئەوەی بمرێت بڕیاری دا پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێت بكرێتە فەرمانڕەوای موسڵمانان هەربەو شێوەیەش بوو خەڵكی هەرهەمووی ڕازیبوون پێی و كردیانە گەورەی هەموو لایەك .

٢- دیاریكردن چەندكەسێكی متمانەپێكراو لەلایەن فەرمانڕەواوە پێش ئەوەی بمرێت بۆئەوەی بەپرس و ڕاوێژ یەكێكیان بكرێتە فەرمانڕەوا هەروەكو پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێت كردی شەش هاوەڵی بەڕێزی دانا تالەنێوانیاندا یەكێك بكرێتە فەرمانڕەوا ئەوبوو پێشەوا عوسمان ڕەزای خوای لێ بێت بەڕاوێژ دیاریكراو بوو بەگەورەی موسڵمانان، یاخود فەرمانڕەوا بەوە ڕاناگات لەبەر هەرهۆكارێك بێت دەمرێت و كەسێك دیاری نەكراوە بۆئەوەی فەرمانڕەوا بێت لەو كاتەدا شورا دێت كەسێك دیاری دەكات تا ببێتە گەورەی موسڵمانان هەروەكو بۆ پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێت كرا

